ئاستانە





# نەنگترین چەواشەکاری

## ڕەخنەگرتن لەو بنەمایانەی موحەممەد شەحروور تەرزەکانی لەسەر بنیات ناوە

نووسین: یووســـــف سەمریـــــن
وەرگێڕان: م. بیلال جەلال حەدداد





یووسف سەمرین

یووسف سەمرین توێژەرێکی فەلەستینییە.

* خاوەنی بڕوانامەی بەکالۆریۆسە لە فیقە و تەشریع لە زانکۆی قودس/ کۆلێژی الدعوة واصول الدين.

* هەڵگری بڕوانامەی ماستەرە لە بواری فەلسەفە لەسەر تێزی (موقف ابن تيمية من المعرفة القبلية وشئ من آثاره الفلسفية).

چەندین بەرهەمی کتێبی هەیە، لەوانە:

١- بؤس التلفيق: ئەم کتێبەی بەردەستت کە بەناوی (نەنگترین چەواشەکاری) بە کوردی کراوە.

٢- تناقضات منهجية لە ڕەخنەگرتن لەسەر تێزی دکتۆراکەی عەدنان ئیبراهیم.

٣- القرآءة العلمانية للتاريخ الاسلامى

٤- بيع الوهم_تهافت طرح أيلال رشيد عن صحيح البخاري.

* خاوەنی چەندین بەرهەمە لە ڕۆژنامە و گۆڤار و دیمانە و بەشداری وانەگوتنەوەی خولی هزریی.

* پێشکەشکردنی چەندین وانەی بەسوودی هزری و فەلسەفی و ئەدەبی و ڕەخنەگرانە.

# نەنگترین چەواشەکاری

## ڕەخنەگرتــن لەو بنەمایانەی موحەممــەد شەحروور تەرزەکانی لەسەر بنیات ناوە


نووسینی:

یووسف سەمرین

وەرگێڕانی:

بیلال جەلال حەداد




# پێشەکی وەرگێڕ

بەناوی خوای گەورە و میهرەبان، سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگارمان، صەڵاواتی بێ ئەندازە بۆ سەر پەیامبەر و یار و یاوەران و خاوخێزانی، پاشان..

لەم سەردەمەدا، هەوڵەکانی تێکەڵ کردنی هەق و باتڵ زۆر بوون، وەکوو پەیامبەرمان(ﷺ) ئاماژەی بۆ کردووە، هەروەها فیتنە و ئاشووبەکان وەکوو شەپۆلی دەریاکان بەتین دەبن.

ئەم سەردەمە تاریکسان و شەپۆلی ئاشووبەکان هاتوون، لەگەڵیشدا لاوازی و کەساسی حاڵی موسڵمانان.

بەڵام هەوڵ و تێکۆشانەکانی هەندێکی زۆر کەم لە موسڵمانان بۆ تێکۆشانی فیکری بەرووی شەپۆلەکان و تاریکییەکاندا دەدرەوشێتەوە، دڵخۆشکارن، نەوەیەکی بوێر و وریا و هۆشیار و خوێنەوار بەرهەم بهێنن بە یارمەتی خوای گەورە.

خوای گەورە لێمان قبووڵ بکات و لەبەر ڕەزای خۆی بێت کارەکانمان.

ئامین ئامین

بیلال جەلال حەداد

ASTANA

# پێش دەستپێک

زۆرن ئەو عەقڵانەی (ژیریيانەی) کە مرۆڤايەتی بەرهەمی هێناون بۆ پێشەوایەتی ملیۆنان خەڵک بۆ چەندین ساڵە، ئیتر ئەو ڕابەرایەتییانە بەرەو خێر بووبن یاخود شەڕ، بەڵام کەسی ژیر، ورد دەبێتەوە لێیان و بەراوردیان دەکاتەوە بە بنەماکانی بیری چەسپاو و بۆچوونی پێکراو بۆئەوەی ڕوون ببێتەوە تا چەند دێتەوە لەگەڵ ژیری و فیترەتدا، ئاخۆ ئاستی پاراوی چەندە لە نەبوونی تێکگیران و دژیەکبوون.

سا لەبەر ئەمە خواستێکی پێویست پەیدا بوو بۆ دامەزراندنی زنجیرەیەک لەم «تیژی فیکرییانە»، جا لەم کتێبەدا نووسەر یوسف سەمرین ڕەخنەکانی پێشکەش دەکات لەسەر کەسایەتییەکی جێ مشتومڕی دەیان ساڵەی نێو گۆڕەپانی ئیسلامی، ئەو کەسەی کە لەم دواییانەدا دووبارە هێنراوەتە پێشەوە و لە (ڕەمەزانی ساڵی ٢٠١٨)دا جارێکی تر هێنرایەوە بەر دیدی خەڵکی، گوایە بیریارێکی ئیسلامییە و کەسێکی تازەگەرە «موحەممەد شەحروور»، بۆئەوەی دووبارە شیرزییەکانی خۆی نوێ بکاتەوە بۆ ماناکاریی بێ سەروبن لە بواری زمانەوانی (قورئانی پیرۆز و سوننەت) بۆ بەلاڕێدا بردنی مەبەستەکانیان، بۆ ئەمەش نووسەر بە دەربڕینێکی پوخت و چڕ و بە ئاماژەیەکی پێویست بۆ دەرخستنی گشت لایەنەکانی پرۆگرام و مەنهەجی شەحروور کار دەکات، ئەمەش بە بەڵگەی بنەماکانی شەحروور خۆی و بەڵگەی قسە و گوفتار و کردارەکانی خۆی.

مرکز الدلائل

## دەروازە

زۆر هەوڵدرا بۆ دەرهێنانی قورئانی پیرۆز لە دڵ و ژیانی موسڵماناندا، بەڵام دوای ئەوە بۆیان دەرکەوت کە ئەستەمە وشەکانی بگۆڕن و یاری بە پیتەکانی بکەن، ناچار پەنایان برد بۆ گۆڕینی ماناکانی لەژێر پەردەی "خوێندنەوەی سەردەمیانە بۆ قورئان"، جا لادان و بیدعەی وەهایان کردووە بۆ وشە و دەقەکانی لە ڕاڤە و مەبەستەکانیدا هەرگیز خوای گەورە بەو ڕەهەندە پەیامەکەی نەناردووە، هەرگیز موسڵمانان لە ماوەی ١٤٠٠ساڵدا لادانی وایان نەبینیوە، لەم هەوڵەدا؛ ڕێچکەی کرۆکگەراکان (باتنییەکان)یان گرتووەتەبەر، بەڵام بانگەشەی ماناکاری بۆ قورئان بە شێوازێکی تر کە بە جۆرێک بوو کەس نایزانێت جگە لە ئەوان!

لەم سۆنگەیەوە سەمەرەی لادانی ماناکانی قورئانیان هێنایەکایەوە لەژێر پەردەی دروشمەکانی «تازەگەریی» و «سەردەمیانە»، لە نکۆڵیبوونی «مزگەوتی ئەقسا» لە فەلەستین دەستیان پێ کرد و بە فەرمانکردن بە ئافرەتی موسڵمان کە پێویستە لەسەری لەکاتی سووڕی مانگانە و زەیسانیشدا نوێژ و ڕۆژوو بگرێت، هەروەها زیناکردن و داوێنپیسی هەرگیز حەرام نییە و بریتی نییە لە پەیوەندیی سێکسی دەرەوەی گرێبەستی هاوسەرگیری، بێگومان حەڵاڵە و کێشەی نییە! هەروەها جنۆکە بوونەوەری پەنهان بوونیان نییە و جۆرێکن لە ئادەمیزادی هاوشێوەی خۆمان، جا لەبارەیی نوێژە فەرزەکانیشەوە هەندێکیان دەڵێن سێ فەرزە و هەندێکیان دەڵێن یەک فەرزە و هەشیانە دەڵێ حەوت فەرز هەیە، سەمەرەی تریشیان هەیە کە دەڵێت نوێژ تەنیا نزاکردنە و کڕنۆش و سوجدەی هەر نییە! یەکێکی تر لە سەمەرەکانی بیدعەیان بریتییە لە باسی باڵاپۆشیی ئافرەتان کە پێی وایە ئەو

بەشانەی جەستەی ئافرەت کە حیجابی لەسەر هاتووە، تەنیا شەقی مەمکێتی لە مانای (جیوب) کە لە سوورەتی نووردا هاتووە و باسی حیجابی شەرعی لایان وەکوو خورافیات و لادانە، جەستەپۆشین ئەوەیە کە تەنیا شەق و ژێری گۆی مەمک و بنی باڵ و دامێن و سمت بپۆشێت ئەمەش بە پێی بیرورایی شەحروور! دەشڵێت: "زۆر ئاساییە ئافرەت باقی جەستە و ئەندامەکانی لاشەی دەربخات و ببینرێت."[١]جا ئێستا بەراورد بکەن لەنێوان ئەمانە و ئاینزاکانی ئەهلی کیتاب کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لەبارەیانەوە دەفەرموویت: ﴿وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُۥنَ أَلْسِنَتَهُم بِٱلْكِتَـٰبِ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَمَا هُوَ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾[٢]

ئیمامی ئیبن کەسیر بە ڕەحمەت بێ لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەفەرموویت: "خودای گەورە لێرەدا باسی جوولەکە دەکات (نەفرەتی خودایان بەسەردا ببارێت)، چونکە کۆمەڵێکیان فەرمایشتەکانی خوای گەورەیان لە ماناکەی لادەدا بۆ مەبەستی تر و وشەکانیشیان دەگۆڕی و دایاندەتاشی بۆ ئامانجی تر، تاکوو نەزانەکان واتێبگەن ئەوەش بەشێکە لە فەرمایشتەکانی خودای گەورە، ئەمانەشیان بە ناوی خوداوە دەکرد، کەچی درۆش بوو بە ناوی خوداوە دروستیان کردبوو، خودی ئەو جوولەکانەش دەیانزانی کە هەمووی درۆ و دەلەسەی خۆیانە بە ناوی خودای گەورەی دەکەن." بۆیە خودای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموویت: ﴿وَيَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾[٣] واتا:

---

(١) ئەم پۆشاکەی کە بە «پکینی» ناسراوە بۆ کەنار دەریا بەکاردێت کاکە شەحروور هێناویەتی بۆ ماناکردنی ئایەتی حیجاب، لە پەرتووکی (الكتاب و القران) لاپەڕەی (٦٠٦-٦٠٧). جا دەڵێت وشەی (جیوب) لە چاوگی (جوب)ەوە هاتووە، لە کاتێکدا ڕاست ناکات و لە چاوگی (جیب)ەوە هاتووە هەروەکوو لە فەرهەنگەکانی زمانی عەرەبیدا هاتووە وەکوو (لسان العرب)ی ئیبن مەنزرو (٧٣٦/١)، نموونەکانی پێشووش کە هێناومانە هەر قسەی شەحروور و هەندێکی ترە لە هاوئاوازەکانی کە بە ناوی «قورئانییەکان» یان «نکۆڵیکارانی سوننەت».

(٢) سورة [آل عمران: ٧٨].

(٣) سورة [آل عمران: ٧٨].

«درۆ بە ناوی خواوە دەکەن و باشیش دەزانن درۆ دەکەن.» ئیمامی موجاهید و شەعبی و حەسەنی بەسری و قەتادە و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس (خوایان لێ ڕازی بێت) فەرموویانە: ﴿يَلْوُونَ أَلْسِنَتَهُم بِالْكِتَابِ﴾ واتە: «ماناکەی لار دەکەنەوە بۆ مەبەستی تر.»

هەروەها ئیمامی بوخاری دەیگێڕێتەوە لە ئیبن عەباسەوە (ڕەزای خودای لێ بێت): "ئەوان ماناکانیان بەلاڕێدا دەبرد و وشە و قسەشیان بۆ زیاد دەکرد، هیچ کەسێک لە میللەتان ناوی خودای گەورەی لە پەرتووکەکاندا نەسڕیوەتەوە، بەڵام ماناکانیان بەلاڕێدا بردووە، بەشێوەیەک مانایان دەکرد کە ئامانجی پەرتووکەکە و ناردنەکەی بەلاڕێدا دەبرد."

سا سوپاس بۆ خودای میهرەبان کە خۆی پاراستنی پەرتووکەکەی لەئەستۆ گرتووە.جێی باسەکە موحەممەد شەحروور لەدایکبووی شاری دیمەشقە لە ساڵی ١٩٣٨، وە لە ساڵی ١٩٦٤ ڕۆیشتووە بۆ وڵاتی یەکێتیی سۆڤیەت بەمەبەستی بەدەستهێنانی دبلۆمی ئەندازیاریی شارستانی لە زانکۆی مۆسکۆ (هەر لەبەر ئەمەیە کە تۆمەتی مارکسی بوونی دەدرێتە پاڵ کە لەو ماوەیەدا باوبووە)،[1] دواتر بە پلەی دکتۆرا لە زانکۆی دیمەشق دادەمەزرێت، پاشان ژمارەیەک پەرتووک بە چاپ دەگەیەنێت لەژێر بانگەشەی "خوێندنەوەی فیکری سەردەمیانە" کە تێیدا باسی لێهەنجینی قورئان دەکات بە دیدگایەکی زەمانەوانی سەردەمیانە، یەکەم نووسینیشی بە پەرتووکی (الکتابو القران_ خوێندنەوەیەکی سەردەمیانە) دەستی پێ کرد کە لە ساڵی ١٩٩٠ دا بوو، وتەکانی لێرەدا زۆر بەڕاشکاوانە و ئاشکرایی پڕبوون لە لادان و گومڕایی بۆ ماناکردنی قورئانی پیرۆز و دروشمەکانی ئیسلام، سەرباری شپرزی نووسینەکانیشی زۆرێک لە نووسەر و بیریاران و بانگخوازان و پسپۆڕانی ئیسلام لەو سەردەمەدا بەرپەرچ و وەڵام و ڕوونکردنەوەی هەڵە و پەڵەکانیان

---

(١) لەم سەردەمانەی شەستەکاندا لای خۆشمان باو باوی شیوعییەت بووە.

دایەوە بە شێوەی کورتە نووسین و نامیلکە و توێژینەوە و پەرتووک کە بەجوانی ڕوونی خاڵە خراپ و لادەرەکانی شەحروریان ئاشکرا دەکرد.

بێگومان هەندێک لەو نووسینانە؛ کاریگەری سۆز و عاتیفەی پێوە دیارە کە کاری کردووەتە سەر لایەنی ڕەخنەیی و زانستی نووسینەکانیان، هەشیانبووە بە تەواویی ڕەخنەیی ورد و ڕێڕەویی زانستییانەی گرتووەتە بەر بۆ دەرخستنی حەقیقەتی ڕێبازی شەحروور، جا لەو پەرتووکانەی کە جێی باسن:

١. (بیضة الدیک_ ڕەخنەی زمانەوانی) بۆ پەرتووکی (الکتاب و القران) نووسەر: (یوسف الصیداوی)، چاپی: التعاونیە. کە باس لەلایەنی بۆش و بەتاڵی شەحروور دەکات بە تەنیا لە سنووری زمانەوانیدا، چونکە نووسەر (یوسف الصیداوی) خۆی پسپۆڕی زمان بووە لە بەشی زمانی عەرەبی لە کۆلێژی ئاداب لە زانکۆی دیمەشق.

٢. (المارکسلامیە و القران) یان (الباحثون عن عمامة لدارون و مارکس و زوجة النعمان)، (قرآءة فی دعوی المعاصر) نووسینی: پارێزەر (محمد صیاح المعراوی)، چاپ: المکتب الإسلامی.

٣. (تهافت القراآءة المعاصرة) نووسینی: (منیر محمد طاهر الشواف)، چاپ: دار قتیبة.

٤. (الإشکالیة المنهجیة فی الکتاب و القرآن، دراسة النقدیة) نووسینی: (ماهر المنجد)، چاپ: دار الفکر المعاصر.

ئێمەش لەم کاتەدا ئەم پەرتووکە بە خوێنەری موسڵمان پێشکەش دەکەین، داواکارین لە خودای میهرەبان بیکاتە هۆی سوود، هۆکارێک بێت بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ڕێڕەو و بەرنامەی ئەو کابرایە.

بڵاوکار

# پێشەکی

الحمدلله، والصلاه و السلام علی رسول الله، و بعد:

بێگومان پەرتووک لە هەموو بوارەکاندا زۆر بووە، لەکاتێکدا زۆرێکیان هیچ بۆ بارخانی مەعریفی زیاد ناکات، جا لە سەردەمێکدا کە چاپ و پەخش و بڵاوکردنەوەیپەرتووک ئاسانە، لەڕاستیدا نووسینی پەرتووک بە ئامانجی بازرگانی لەگەڵ ئامانجە زانستییەکاندا تێکەڵاو بووە، هەندێک وادەزانن هەرچی بریسکەی دایەوە زێڕە، لەم بارەدا لێیان تێکەڵ دەبێت، و وادەزانن سوودی پەرتووک بە زۆروبۆرکردنی ژمارەی لاپەڕەکانی زیاتر دەبێتەوە، جا لەبەر کارانەبوونی بیری ڕەخنەگریی کە هۆکارە بۆ کەم کردنەوەی پەرتووکە شڕۆڵەکان، هەندێک کۆلکە نووسەر سەرمەست دەبن بە پڕکردنەوەی پەڕەکەکان بەناوی پەرتووکەکانەوە، ئەگەر چی تەنیا پووشوپەڵاش بنووسێتەوە و هیچ بەهایەکیشی نەبێت، خۆ چەپڵەڕێزانی هاوئاوازەکانی هەر بازاڕی بۆ گەرم دەکەن.

جا لە نموونەی ئەو پەرتووکانەی کە دەناڵێنێت بەدەست نەخۆشی قەبەبوون و قەڵەوبوونی نووسین و پەڕەکانییەوە پەرتووکەکانی «موحەممەد شەحروور»ە، لەکاتێکدا بەم تەرزە لە نووسین و هونەری پڕکردنەوەی سەدان پەڕەی ڕەشەوەکراوی شەحروور، دەکرێت لە چەند پەڕەیەکی کەمدا کورت بکرێتەوە، کەچی ئەو «شەحروور» گاڵتە بە پەرتووکی فیقهی ئیسلامی دەکات گوایە درێژدادڕن، جا دەڵێت: "فیقهی پەرستشەکانی وەکوو دەستنوێژ و نوێژ و حەج و زەکات هێندە زۆر بووە گەیشتووەتە چەندین بەرگە پەرتووک، لەکاتێکدا پەرستشەکان بۆ زانا و نەزان بەڕوونی هاتوون و بۆ خەڵکی گشتی و تایبەتەکانیش بە وردی هاتوون،

هیچ پێویست بەم هەموو پەرتووکە فقهیە ناکات"[١]

ئەم کابرایە خۆی لەبیرکردووە! دەی جا ئەگەر بابەتەکان بەو ڕوونییەبن کە خۆت دانی پێدا دەنێیت ئیتر بۆ سەدان پەڕە دەنووسێت و دەم دەکوتی لە هەموو بابەتێکی ئایینی؟! خۆی گوتەنی ئایینەکە بۆ هەموو کەسێکی تایبەت و گشتی هاتووە، ئیتر بۆ خۆی ئەو هەموو پەرتووکەی نووسی؟

لێرەدا باسی شتی ڕووکەشمان بەلاوە گرنگ نییە، درێژی قسەکانی و کورتیشی هەر گرنگ نین، هیچ ئەندازە و قەبارەیەکمان بەلاوە گرنگ نییە هەرکەسێک فیکر و بیروباوەڕی خۆی تێدا بڵاو دەکاتەوە، چونکە باسی گوتارمان لێرەدا لە بواری هونەریی و جوانکارییەوە نییە، باسی ڕەوانبێژیش نییە، بەڵکوو لەلایەنی مەعریفییەوە قسە دەکەین، چونکە چاوی ڕەخنەگر وردبینە بۆ گرنگترین خاڵ، ئەوەش ئەوەیە کابرا لە بواری شەرعیدا قسەی کردووە، هەر لە بنچینە (أصول) و باوەڕ و شەریعەتیش بەشێوەیەکی گشتی قسە دەکات و دەنووسێت.

جا با ،موحەممەد شەحروور بمانبووریٚ نازناوی (دکتۆر)مان لەناوهێنانی سڕیوەتەوە، چونکە ئەو لە بواری ئەندازیاریدا پسپۆڕە، لێرەشدا باسەکان بە ئاقارێکدا دەڕوات کە لە پسپۆڕییەکەی ئەو نییە، چونکە ئەو لە ناوەندە ئایینییەکاندا زیاتر ناسراوە بەهۆی نووسینەکانییەوە، ئەو پەرتووکانەی کە بڵاوی دەکردنەوە بە بانگەشەی خوێندنەوەیەکی تازە و بنچینەی تازەوە! گوایە لەسەر ڕێسایەکی تازەدا دەڕوات، هەر بۆیە بە گوتەی خۆی وەسفی دەکات و دەڵێت: "ڕێبازی ئێمە لە خودی خۆیدا خاڵە گرفتەکان دیاری دەکات، بەبێ سۆزیاری و خۆشەویستی."[٢]

---

(١) الدولة و المجتمع، محمد شحرور، الاهالي للطباعة و النشر و التوزيع، دمشق، سورية، ص ٢٣.

(٢) نحو أصول جديدة للفقه الاسلامي، محمد شحرور، الأهالي للطباعة و النشر، دمشق-سورية، الطبعة الأولى ٢٠٠٠م، ( ص١٥).

جا دەمارگیریی (کە خۆی ناوی ناوە بەرنامە) دەگاتە ئەو ئاستەی کە شێوازی مامەڵەی لەگەڵ ڕا جیاکانیدا بگاتە ئەوەی ناتۆرەی حەرامکاریی کڵێسایی بداتە پاڵیان و پێیان بڵێت: "توراس پەرستان"[١]، بەبێ ئەوەی سڵ بکاتەوە کە ئەم دەربڕینە بە ڕوونی مانای بەکافر دانانی تێدایە و تانەی ئەوەیان لێ دەدات کە جگە لە پەروەردگار دەپەرستن.

لێرەوە پرسیارەکە دروست دەبێت، ئەم مەنهەج و ڕێڕەوە چییە کە موحەممەد شەحروور لەسەریەتی کە دەتوانێ تاکوو کوێ پڕبکات؟

هەروەها دوای لابردنی ئەو هەموو پەرەپڕکردنەوەی کە لە پەرتووکە دووروودرێژەکانیدا پڕی کردووەتەوە، ئاخۆ دەکرێت بە کورتی بە چ ئەنجامێک بگەین لە تێزەکانیدا؟ لەسەر چ بنچینەیەک ڕۆیشتووە؟ بەجۆرێک کە کەسێک خۆی بداتە پاڵ مەنهەجەکەی نەک خودی شەحروور، هەروەها بتوانرێت ئەو ڕێبازە بگرێتەبەر و بتگەیەنێتە ئامانج بەبێ خودی شەحروور، نەک هەر چەمکێکی بگریت سەرت لە بۆچوونە خزاو و خوارەکانی شەحروورەوە دەربکات، کە هیچ کۆکارێکی تیۆریی کۆی نەکاتەوە و ئاکامێکی نەبێت.

ئەمەش ئەو بابەتانە دەبن کە لەم پەڕانەدا وەڵام دەدرێنەوە، بۆئەوەی وێنای تەرزەکەی بکەین وەکوو خۆی بەبێ ئاوەژووکردنەوە و ڕازانەوە، بە ئامانجی دەرخستن و چارەکردنی نەنگییەکانی بە پێوەرەکانی ڕەخنە، جا لەبەر ئەوەی هەموو جارێک بە گژی ڕەخنەگرانیدا دەچێتەوە کە لە نەیارانییەوە ئاراستە دەکرێن، گوایە ڕەخنەکە لە بابەتەکان دەرچووە و ڕووی کردووەتە خودی کەسێتی نووسەر، بۆئەوەی ئەم بیانووە نەمێنێت لەڕووی ئەم چەند دێڕەدا دەوترێت:"نووسەریش هەر مرۆڤە و پێگەی هاوتای پێگەی ڕەخنەگرانە، پێگەی

---

(١) تجفيف منابع الإرهاب، محمد شحرور، مؤسسة الدراسات الفكرية المعاصرة، بيريوت-لبنان، الأهالي للتوزيع، دمشق-سورية، الطبعة الأولى: ٢٠٠٨م، (ص٨٦).

نووسەر بەرزتر نییە لەوەی کە ناوی نەهێنرێت و گوتاری ئاراستە نەکرێت و ڕەخنەی ئاراستە نەکرێت و قسەیەکی لەڕوو نەدرێت."

جا کاتێک نووسەرێک سینگ دەردەپەڕێنێت؛ لێرەدا خوێنەریش مافی خۆیەتی ڕەخنەی لێ بگرێت، لەبارەی شیاوێتی و ئەهلییەتی ئەم نووسەرە بپرسێت، ئەمەش -هەرچەندە ئاراستەی کەسێتی نووسەرەکە دەکرێت- چونکە بابەتەکە پەیوەستە و بەگشتی بەندە لەسەر تەرزی نووسەر کە خستوویەتییە ڕوو نەک بابەتێکی تایبەتی کەسێتی، بۆیە ئەمەش پێویستی بەم هەموو دارشتنەوەیە نییە و پەیوەندی بە خۆبەهەڵەدابردن نییە لە بیانووی ڕەخنە و کێشەی شەخسی[١]، چونکە ئەگەر پەن و کۆڵەواریی نووسینەکەی هێندە قووڵ بن کە بگاتە تانەدان لە خودی نووسەرەکە بەهۆی نەبوونی شیاوێتی و شایستەیی بۆ نووسین لە بابەتێکدا، ئیتر ڕەخنەگر لۆمە ناکرێت کە بۆچی ناوی کەسی نووسەری هێناوە! چونکە نووسەر خۆی خەتابارە بەوەی پێش پێگەیشتن دەستیداوەتە نووسین و سنگ دەرپەڕاندن، لێرەوە با ئەو حاڵ و بیانووانە ئەم چەند دێرەی ئێمە نەگرێتەوە کە ڕەخنەئامێزانە لەبارەی نووسینەکانی موحەممەد شەحروورەوە دەینووسین، با نەڵێن لە خودی کەسەکەتان داوە، بەڵکوو ئەوە خودی شەحروورە کە بانگەوازی بۆ دەکات لەژێر دروشمی "بۆ هەموو عەقڵێکی ڕەخنەگری ڕووناکبیر کە دەکۆڵێتەوە بۆ گەیشتن بە هەقیقەت لە هەر کوێ بێت."[٢] وەکوو وتراوە: بانگەوازەکەت گەیشت، بگرە وەڵامی هاوئاستیش بۆ خۆت و ئەوانەش کە شوێنت کەوتوون.

بێگومان بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە هەمیشە پێویستە هەبێت، چونکە ڕەخنە

---

(١) حول تعريف هذه المغالطة، انظر: المغالطات المنطقية، عادل مصطفى، المجلس الأعلى للثقافة، القاهرة، ٢٠٠٧م، (ص٦٩).

(٢) م الكتاب و تفصيلها، قراءة معاصرة للحاكمية الإنسانية تهافت الفقهاء و المعصومين، محمد شحرور، دار الساقي، بيروت-لبنان، الطبعة الأولى: ٢٠١٥م، (ص١٣)..

خوێنی زیندەگی فەلسەفەیە[١]، لەوێدا هیچ جۆرە مەعریفەیەک نامێنێ بە بێ ڕەخنەی عەقڵی[٢]، وەکوو ئاشکرایە ئەمەش لە کەلەپووری ئیسلامیماندا بەشێوەیەکی زیندوو زانراوە، لێرەدا چەندین ناوی پرشنگدار دەبینیت لە بواری ڕەخنەی فەرموودەدا وەکوو: «ئیبن مەدینی، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئیبن موعین» (ڕەحمەتی خودایان لەسەر بێت). جگە لەئەمانەیش. ئای چەند پێویستمان بە نموونەی ئەو پیاوانە هەیە لەم ڕۆژگارەدا کە شان بە شانی ڕەخنەگرانی فیکرەوە هەبن! هەروەکوو ئەوەش ئاشکرایە زانایانی فەرموودە هەر بە خوێندنەوە و ڕەخنەی بواری فەرموودەوە نەوەستاون، بەڵکوو ڕەخنەگری بواری فیکریش بوون، بە شوێن ڕەگ و ڕیشاڵەی فیکر و دەرخستنی نەنگی و عەیبەکانیدا بوون بۆئەوەی بەسەر خەڵکیدا تێنەپەڕێت و نەزانستە بەسەریدا گوزەر نەکەن. نموونەی ئەم زانایانەش ئیبن تەیمییە و ئیبن قەییم و زۆری تریش جگە لە ئەمان (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت)، تەماشاکە ئیمامی ئیبن قەییم (بەڕەحمەت بێت) چەند جوان دەهۆنێتەوە و جاڕی بەردەوامی دەدات لەسەر ڕەخنەگرتنی فیکرە لاڕێییەکان:

ولأفضحنَّهم على رأس الملا    ولأفرينَّ أديمهم بلساني

ولأكشفن سرائراً خفيت على    ضعفاء خلقك منهم ببيان[٣]

واتا: لەناو خەڵکیدا ئابڕوویان دەبەم - چاتۆڵەی سەریان دادەڕوخێنم بە زمانم

نەنگی و نهێنیان لە خەڵکانی لاواز دیار نییە - بەڕوونی و بەئاشکرایی بەیانی دەکەم

---

(١) بحثا عن عالم أفضل، كارل بوبر، ترجمة: أحمد مستجير، مهرجان القراءة للجميع، القاهرة، ١٩٩٩م، (ص٢٢٥).

(٢) بحثا عن عالم أفضل، (ص٣٥).

(٣) الكافية الشافية في إنتصار للفرقة الناجية، محمد بن أبي بكر بن أيوب ابن قيم الجوزية، تحقيق: محمد بن عبدالرحمن العريفي - ناصر بن يحيى الحنيني - عبدالله بن عبدالرحمن الهذيل - فهد بن علي المساعد، دار عالم الفوائد، مكة، الطبعة الأولى: ١٤٢٨هـ (ص١٥٥)..

جا بۆ بەردەوامی کەژاوەی ڕەخنە، ئەم چەند دێڕە ڕەخنە پێشکەش دەکەین لەسەر ئەو بنەمایانەی کە موحەممەد شەحروور تەرزەکانی لەسەر پێشکەش کردوون، لەبەر ئەوەی کاری ڕەخنەگرانەش لە شیکاریی دانابڕێت، هەڵدەستین بە شیکارکردنی ئەوەی نووسەر (شەحروور) دەیڵێت، گەڕاندنەوەی بۆ بنچینەکانی، هەرچەندە هەندێک بابەتی تەنیا بە دەرخستنی بنەماکەی هەڵدەوەرێت و شوێنی ملپێچدانی دەق بۆ کەش و بارە تایبەتەکەی ڕوون دەکەینەوە، ئاخۆ تا چەند پەیوەیستە بە مەبەستە خوازراوەکەی؟ ئایا چۆن دەبێت ئەگەر وتە و دەربڕینەکانی هیچ بنەمایەکی لە بنەماکانی بەڵگە و بورهان نەبێت؟! هەرچۆن پشکنینی مەودای گونجاویی تەرزە فیکرییەکانی دەکەین، ئەوهاش ئاستی چەواشەکانی دەردەخەین، تا بزانین تا چەند (تێکەڵەیەکی ناڕێکوپێکی کردووە لە بۆچوونگەلێکی جیاوازی دژبەیەکی ڕەها لە فەلسەفە و پێشەکی تیۆریی و پێوەرە سیاسییەکان.)[1] ئەم پێوەرەش بۆچوونەکانی بواری بیروباوەڕیی و فیقهی و هاوشێوەکانی تریان دەگرێتەوە.

جا بۆ پێداگیری خوێندنەوەی هەموو ئەوانەی موحەممەد شەحروور نووسیوونی بە دڵنیاییەوە ئەم پەرتووکە بەدواداچوونی کردووە بۆ ئەم پەرتووکانەی خوارەوە کە موحەممەد شەحروور نووسیویانێتی:

١. الكتاب و القران.

٢. القصص القراني (جزأين)

٣. الإسلام الأصل و الصورة.

٤. الإسلام والإيمان.

٥. الدولة والمجتمع.

---

(١) الموسوعة الفلسفية، بإشراف: روزنتال، يودين، ترجمة: سمير كريم، مراجعة: صادق جلال العظيم، جورج طرابيشي، دار الطليعة للطباعة و النشر، بيروت-لبنان، (ص٥٢٤)، بتصرف يسير.

٦. نحو أصول جديدة للفقه الإسلامي.

٧. السنة الرسلية و السنة النبوية و رؤية جديدة.

٨. الدين والسلطة قراءة معاصرة للحاكمية.

٩. تجفيف منابع الإرهاب.

١٠. دليل القراءة المعاصرة للتنزيل الحكيم.

١١. الإسلام والإنسان: من نتائج القراءة المعاصرة.

١٢. أم الكتاب.

بەڕاستی من بەدوای هەموو وردە باس و بابەتێكی لاوەكیدا نەگەڕاوم لە نووسینەكانی شەحروردا، بەڵكوو هەموو وردبوونەوەم چڕكردووەتەوە لەسەر ئەو بنەمایانەی كە كۆی نووسینەكانی لەسەر بوونیاد ناوە، لە ڕووی بابەتی و گونجان و نەگونجان و بنەمای فیكرییەوە، ئەگەر چی هەندێك جار دەبینیت ڕۆشتوومەتە نێو باسێكی لاوەكییەوە ئەویش لەبەر هەبوونی پەیوەندی بە بنەماكەیەوە، هەروەها بۆ ڕوونكردنەوەی لایەنی پراكتیكی یان بۆ ڕوونكردنەوەی پێویستییەكانییەتی.

یوسف سەمرین

شاری قودس

## دژی چەسپاوەکان!

ئەو ناونیشانە زادەی هەڵچوون و زێدەڕەوی نییە بە مەبەستی بەدکاریی، بەڵکوو ئەوە خودی بانگەشەی موحەممەد شەحروورە کە دەڵێت: "فیقهی ئیسلامی وەکوو ئەوەی فوقەهای سەدەکانی دووەم و سێیەمی کۆچی بۆیان داڕشتووین، هەروەها زانستەکانی قورئانیش هەموو پێویستی زۆریان بە دووبارە چاوپیداخشاندنەوە هەیە، بەتایبەتی ئەوەی ناویان لێناوە چەسپاوەکان یان بنەماکان. لە کاتێکدا ئێمە لەم ڕۆژگارە پێویستمان بە دووبارە بنەواکردنەوەی خودی بنەما چەسپاوەکانە، هەروەها دووبارە چاو پێداخشاندنەوەی ئەوەی پێی دەڵێن ئەحکامی شەرعی و بەڵگەکانییەتی."[١]

ئەو دەیەوێت بە هەموو بنەما و چەسپاوەکاندا بچینەوە، ئەڵبەتە ئەو بنەما و چەسپاوانەی کە شەحروور بە خەڵکەکەی دەڵێت: "بەندەکانی توڕاس"، ئیتر هیچ نامۆ نییە لێرەوە هێرش بکاتە سەر ئیمامی شافیعی -کە یەکەم زانایە بنەماکانی ئوسوڵی دانابێت، کە شەحروور بە نکۆڵیکارییەوە دەپرسێت: "ئاخۆ ئێمە توانیومانە شافعی تێپەڕێنین لە ئوسوڵی فیقهدا و خۆمان ئوسوڵێکی تر دابهێنین؟"[٢]

جا بەم ئاستەشەوە نەوەستاوە، بەڵکوو گەیشتووە بەوەی تانە لە ئیمان و دینداریی ئیمامی شافیعی (بەڕەحمەت بێت) دەدات، دەڵێت: "شافیعی دینی

---

(١) تجفيف منابع الإرهاب، (ص٣٠٤)..

(٢) الدولة و المجتمع، (ص٢٢٨).

خۆی فرۆشتووە بە دونیای خەڵکی."[1] بەڵکوو تۆمەتی ئەوەی داوەتە پاڵی کە "زانای کاسەلێسی دەسەڵات بووە و لە بابەتی فیقهیدا خاترانەی گرتوون."[2]، جا با بزانین مەودای تێگەشتنی شەحروور بۆ وتەکانی شافیعی لە چی ئاستێکدایە؟!

لەم وتەیەیدا دەردەکەوێت: (ئیمامی شافیعی لە پەرتووکی (الرسالة)دا نکۆڵی لە ڕۆڵی هەواڵ و فەرموودەی ئاحاد دەکات لە بواری باوەڕ و عەقیدەدا.)[3]

دەبینی لێرەدا بانگەشەی ئەوە دەکات کە شافیعی (بەڕەحمەت بێت) لە (الرسالة)دا فەرموودەی سەحیحی ڕەتکردووەتەوە و وەرینەگرتووە ئەگەر هەواڵدەر و ڕاوییەکە لەجۆری ئاحاد بوویێت لە بواری بیروباوەڕدا کە ئەمەش تەنیا درۆیەکە، هەرگیز ناتوانێت لە هیچ دێڕێکی پەرتووکی (الرسالة)دا ئەو بڕگەیە بهێنێت کە ژێدەری بانگەشەکەی بێت، بەڵکوو ئیمامی شافیعی یەک دەروازەی سەربەخۆی لە پەرتووکی (الرسالة)دا داناوە بە دوور و درێژی باسی چەسپاندنی هەواڵ و فەرموودەی ئاحاد دەکات، کە پێویستە وەربگیرێت وەکوو و بەڵگە و هەرکەسیش وەرینەگرێت لە گوێڕایەڵی پەیامبەر (ﷺ) لایداوە، بەڵکوو نە ئیمامی شافیعی و نە هیچ زانایەکی ئەهلی حەدیس هیچ جیاوازیان نەکردووە لەنێوان ئەو فەرموودانەی بۆ بابەتی ئەحکامن لەگەڵ ئەو فەرمودانەی لە بابەتی سیفاتی خوای پەروەردگارمانن، بەڵکوو جیاوازی نەکراوە و نەبووە لەنێو هاوەڵان و تابیعین و ئەوانەشی شوێنیان کەوتوون و بەڵکوو نەزانراوە لە زانایانی ئیسلامەوە، بە پێچەوانەوە ئەم جیاکارییە لە ئەهلی

---

(١) تجفيف منابع الإرهاب: (ص٨٤)..

(٢) تجفيف منابع الإرهاب: (ص٨٤)..

(٣) نحو أصول جديدة للفقه الإسلامي، (ص١١١)..

بیدعە و ئارەزووبازانەوە بیستراوە و زانراوە.[١]

بێگومان ئەم قسەیە داهێنراوە، هەرگیز ئیمامی شافیعی (بەڕەحمەت بێت) جیاوازی نەکردووە لەنێوان فەرموودەی ئاحاد کە لە بابەتی بیروباوەڕدا (ناو و سیفاتە بەرزەکانی پەروەردگار) هاتبێ لەگەڵ ئەوەی لە بابەتی ئەحکام و فیقهدا هاتبێت، جیاواز لە بانگەشەکەی شەحروور دەیڵێت! بەڵکوو ئیمامی شافیعی (بەڕەحمەت بێت) لە پەرتووکی (الرسالة)دا بە دەق فەرموویەتی: "ئیسلامەتی و بەڵگە بە هەواڵ و ڕیوایەتی یەک کەسیش دەچەسپێت بە مەرجێک کەسەکە متمانە و ڕاستگۆ بێت." لەمەشدا پشت بە کرداری پەیامبەرمان (ﷺ) دەبەستێت: پەیامبەرمان (ﷺ) کەتیبە و ئەمیرەکانی دەنارد -هەمووشیان دەسەڵاتداری ئەو شوێنانە بوون کە بۆی ناردبوونی- فەرمانی پێ دەکردن کە بانگەوازەکە بگەیەنن بەو خەڵکەی کە پێیان دەگەن و جیهادی ئەوانەش بکەن کە شیاوی جەنگ و جیهادن، ئەم فەرمانەش بۆ هەموو والی و بەرپرسێک بوو، لە کاتێکدا دەکرا لە یەک بەرپرس زیاتر بنێرێت بۆئەوەی ببنە بەڵگەی موتەواتیر، وەکوو ناردنی دوو یان سێ یان چوار بانگخواز و والی بۆ شوێنەکان.

لە کاتێکدا لە یەک ماوەدا دوانزە نێردراوی نارد بۆ دوانزە پادشا، بانگەوازیان کردن بۆ ئیسلام، خۆ ئەم تاکە کەسانەی تەنیا بۆ چەسپاندنی بەڵگەی ئیسلام و نەمانی بیانووی ناموسڵمانان دەنارد.[٢] دەبینین ئیمامی شافیعی (بەڕەحمەت بێت) ئەوانەی سەرەوەی کردووە بە بەڵگەی چەسپاندنی هەواڵی ئاحاد بۆ گەیاندنی ئیسلام و لە گەیاندنی بیروباوەڕ و عقیدەشدا ڕوونیشی کردووەتەوە کە پەیامبەرمان (ﷺ) دەیتوانی زیاتر لە یەک کەس بنێرێت بۆ ئەو مەملەکەتانە

---

(١) مختصر الصواعق المرسلة على الجهمية و المعطلة، ابن قيم الجوزية، تحقيق: سيد عمران، دار الحديث، القاهرة، ٢٠٠٥م، (ص٥٧٠)..

(٢) الرسالة، محمد بن إدريس الشافعي، تحقيق: أحمد شاكر، مكتبة دار التراث، القاهرة، الطبعة الثانية: ١٩٧٩م، (ص٤١٧، ٤١٨)..

بۆ بانگەوازیی کردنیان بۆ ئیسلامی مەزن، لێرەشەوە؛ بەڕوونی دەرکەوت کە شەحروور درۆی هەڵبەستووە بۆ ئیمامی شافیعی (بەڕەحمەت بێت)، بەوەشەوە نەوەستاوە تاگەیشتووە بە تانەدان لە دین و ئیمانی شافیعی (بەڕەحمەت بێت)، جا ئەم نموونەیە دەیەوێت لە سنوورەکانی ئیمامی شافیعی (بەڕەحمەت بێت) تێپەڕێت، لە کاتێکدا نەگەیشتووە بە قولە پێی شافیعی (بەڕەحمەت بێت)، بەڵکوو ئەوەندە بێ تەماعە ڕازییە بە درۆ هەڵبەستن و تەواو، هێندە بێ ڕووە درۆکەشی داوەتە پاڵ پەرتووکی (الرسالة)، وەکوو بڵێی کەس دەستی بە پەرتووکەکە ناگات و درۆکەی ئاشکرا نابێت، لە کاتێکدا پەرتووکەکە چاپکراوە و بەردەستە لە پەرتووکخانەکاندا، بەڵکوو لە ئینتەرنێت و پێگەکاندا هەیە و ئاسانە ببینرێتەوە، ئەم شێوازە نەزۆکەی درۆکردن لە زۆربەی نووسینەکانی شەحرووردا بەرچاو دەکەوێت کە زۆرجار تەنیا ناوی پەرتووکەکان لە پەراوێزی نووسینەکانیدا دەهێنێت تەنیا بۆ پیشاندانی وەکوو سەرچاوە و ژێدەر، وەکوو بڵێی جوان لێکۆڵیبێتەوە و خوێندبێتیەوە.

بەهەرحاڵ شەحروور نەفەنی دەیەوێت لە (الأصول) و بنەماکان قوتار ببێت، بۆ ئەوەی دەرگای قسەکردنی فراوان ببێتەوە بەبێ هیچ بەربەست و بنەمایەک، دواتر لەم ڕێگە خواروخێچەوە خۆی وەکوو موجتەهید نیشان بدات، سەرباری ئەوەی نەزانە بە هەموو پێوەر و بنەماکانی ئیجتهاد لە زانستەکانی شەریعەت، جا دەڵێت: "بێگومان ئەگەری ئیجتیهاد لەنێوان ئەو چوارچێوەیەی کە لە سەدەکانی دووەم و سێیەمدا دانراوە بەسەر چووە، لەم سەردەمەدا ئیجتهاد بەو پێوەرانە زۆر ئەستەمە مەگەر تێیان پەڕێنین و لێیان بوگزەرین و بگەین بە خوێندنەوەی نوێی ڕۆژگارانە بۆ قورئان، بە پشت بەستن بە بنەمای تازە بۆ تەشریعی ئیسلامی."(١)

---

(١) الدين و السلطة قراءة معاصرة للحاكمية، محمد شحرور، دار الساقي، بيروت-لبنان، الطبعة الأولى: ٢٠١٤م، (ص٢٩٦).

ئەو بنەمای تازەی دەوێت بۆ تەشریعی ئیسلامی، بۆیە ئاشکرای دەکات کە "ئەوەی ناونراوە بنەماکانی فیقهی و ڕێکارەکانی شەریعەت توانای کارکردنی لەدەست داوە لە زۆربەی کایەکاندا، ئەگەر نەڵێین هەمووی."(١) ئەوەیشی بە ئاشکرا وتووە کە"قسەڵۆکی بەناو (أصول الفقه) کە شافیعی دایتاشیوە و ناونیشانی لێ هەڵواسیوە بە قورئان و سوننەت و کۆڕایی و پێوەر."(٢) "شوێنکەوتنی وتەی پێشین هەڵەیەکی زەقە و چەواشەکردنی خەڵکییە."(٣)

جا شەحروور دەیەوێت لە هەموو ئەو بنەما ڕێکانە خۆی قوتار بکات بۆئەوەی هەندێک «ڕێکاری تازە» وەکوو خۆی لە بارەیەوە دەڵێت:

"بێگومان پەیامهێن (ﷺ) هەموو ئەرکەکانی سەرشانی بە جوانترین شێوە گەیاندووە (وەکوو نێردراو) لە بارەی هەموو بابەتە پەنهانی و غەیبییەکانەوە کە بە وەحی پێی دراوە، کە ئەمەش بەشێکی گەورەی پەرتووکی قورئانی کەریمە، جا پەیامهێن (ﷺ) جگە لە گەیەنەرێکی بابەتە غەیبییەکان شتێکی تر نەبووە، چونکە بەرەهایی بێگومانین لەوەی هیچی لێنەزانیوە، لەبەر ئەوەش بووە کە هەرگیز خۆی نەداوە لە ڕاڤەکردنی بابەتە غەیبییەکان، چونکە کلیلی بابەتە پەنهانەکان لە ناو خودی قورئاندا حەشاردراوە، ئەوەش مانای ورد و درشتێتی قورئانە، هەرگیز لە پەیامهێنەوە (ﷺ) دەرنەخراوە، بەڵکوو تێفکران و وردبوونەوە لە ماناکانی غەیب دراوە بەدەستی ئەو خەڵکەوە کە پەیامی قورئانیان بۆ نێردراوە و پەیامهێنیش (ﷺ) تەنیا گەیاندوویەتی و بەبێ ڕاڤەکردن، تاکوو ببێتە بەڵگەی پەیامبەرێتی، بیشبێتە بەڵگەیەک بۆ مەودای

---

(١) السنة الرسولية و السنة النبوية و رؤية جديدة، محمد شحرور، دار الساقي، بيروت-لبنان، الطبعة الأولى: ٢٠١٢م، (ص٢١١).

(٢) المصدر السابق. (ماناى وشةكان: الكتاب و السنة و الإجماع و القياس, و أقوال السلف)..

(٣) القصص القرآني قراءة معاصرة، محمد شحرور، دار الساقي، بالإشتراك مع مؤسسة الدراسات الفكرية المعاصرة، بيروت-لبنان، الطبعة الأولى: ٢٠١٠م، م١/ص٢٤٢)..

زانستی پەیامبەرێتییەکەی."[1]

بەم بنەمایەی شەحروور بێت، پەیامبەری ئیسلام (ﷺ) لە مانای زۆرینەی قورئانی پیرۆزی نەزانیوە، بەڵکوو تەنیا گەیاندوویەتی بە خەڵکی، گەیاندنیش بەپێی بیری شەحروور واتا تەنیا خوێندنەوەی بەسەر خەڵیکدا و تەواو، وەکوو بڵێی نووسراوێکی پڕ نهێنی بگەیەنێت بە خەڵکی و هیچیان بۆ ڕوون نەکاتەوە، لە کاتێکدا خەڵکەکەش هیچ زانیارییەکیان لەسەر قورئانەکە نییە، لەبەر ئەمەش بووە کە ڕاڤەی نەکردووە و شی نەکردووەتەوە بۆ هیچ کەسێک! بەڕاستی ئەمەی شەحروور دەیڵێت تەنیا تێکەڵوپێکەڵەیە، چونکە درۆی نەزانین دەداتە پاڵ پەیامبەری خوا (ﷺ) ئیتر چۆن مافی شیکردنەوەی قورئانی بداتێ؟! کەچی لەولاوە ئەرکی تەفسیری ئایەتەکانی باسی غەیب دەداتە دەستی جگە لە پەیامبەر(ﷺ)، بەم شێوەیە پێگە و پلەیەک دەدات بە خەڵکی کە بە پێغەمبەری (ﷺ) ڕەوا نابینێت! چونکە دەڵێت تێگەشتن و وردبوونەوە و تێفکران لەم ئایەتانە کاری خەڵکییە! وەک بڵێی پەیامبەر (ﷺ) لە قورئان وردنەبووبێتەوە و تێنەفکرابێت و مافی ئەوەشی نەبووبێت! تۆ بڵێی کێ باشترین و تێگەیشتووترین کەس بێت لای شەحروور؟!

دەڵێت: "باشترین ڕاڤەکاری ئایەتەکان لە بارەی بەدیهێنانی مرۆڤەوە بریتییە لە زانای پلە بەرز «چارڵز داروین»! جا ئاخۆ داروین هیچ لە قورئانی زانیوە؟ شەحروور دەڵێت: "هیچ گرنگ نییە لە قورئان بزانێت، لەبەر ئەوەی داروین بە شوێنی هەقیقەتی بنچینەی مرۆڤدا گەڕاوە، قورئانیش باسی هەقیقەتی بەدیهێنانی مرۆڤی کردووە، بۆیە پێویستە قورئان و داروین هاوڕا بن ئەگەر داروین لەسەر هەق بوو، چونکە باوەڕم وایە تیۆرەکەی داروین لەسەر بەدیهاتنی مرۆڤ بە شێوە گشتییەکەی ڕاستە."[2]

---

(١) المصدر نفسیه، (ص١٠٣).

(٢) الکتاب و القران: (ص١٠٦)..

ئەم کابرایە پێی وایە پەیامبەری خوا کە قورئانی بەسەردا نازڵ بووە و بە زمانی خۆیشی بووە، کەچی هیچی نەزانیوە لە بارەی زۆرینەی قورئانەوە، لەولایشەوە دەڵێت: "داروین باشترین ڕاڤەکاری بەشێکە لە ئایەتەکانی قورئان بەبێ ئەوەی پێویست بێت داروین لە زمانی قورئان هیچیشی زانی بێت!" بە بیانووی ئەوەی کە شەحروور پێی وایە گوایە تیۆرییەکەی داروین ڕاستە و تەواوە، یان دەڵێت: "مادام داروین ویستوویەتی بگات بە هەقیقەت، کەواتە لەگەڵ قورئاندا دێتەوە و کێشەی نییە!" توخوا ئەمە کەی مەنتیقە؟! جا دەڵێت: "پەیامهێن (ﷺ) پەیامەکە و هەواڵی پەنهانەکان و چیرۆکی پێشووەکانی گەیاندووە بەبێ ئەوەی هیچ لە ماناکانیان تێگەشتبێت، بەڵکوو بەبێ ئەوەی توانای ڕاڤە و شیکردنەوەی هەبوویێت بۆ خەڵکی سەردەمەکەی خۆی، بۆیە بەڕاستی ئەرکێکی گەورە و قورسی هەبووە، چونکە ئاخۆ چەند قورس بووە لە سەری ئەو خەڵکە تێبگەیەنێت لە شتانێک کە توانای تێگەشتنیان بۆی نەبووە، نموونەی بابەتەکانی کۆڕپەلەزانی."[١]

کورە ئەم کابرا، پەیامبەر (ﷺ) بە ئامێری دێڕ خوێندنەوە تێگەیشتووە، جا لەبارەی گەیاندن و بانگەوازیی پەیامبەرهوە (ﷺ) دەڵێت: "بڵاوی کردووەتەوە بە دەنگ و زمانی خۆی بۆئەوەی خەڵکی بیبیستێت، بەڵام بەبێ ئەوەی یەک وشەی لێ ڕوون بکاتەوە."[٢] ئەم کابرایە وەکوو ڕادیۆ و هێڵی پەخش و کاغەز و ئامێرەکانی چاپ و پەخش لە پەیامبەر دەڕوانێت، بە بیانووی ئەوەی گەیەنەری پەیامی پەروەردگاریەتی، بەڕاستی ئەمە سەیرە! چونکە گەیاندنی پەیامی پەروەردگاری پێویستە گەیەنەرەکە سەرەتا خۆی لێی تێگەشتبێت، چونکە کۆمەڵێک بەڵگە و پەیامی هێنابێت بۆ خەڵکی و خۆیشی هیچی

---

(١) السنة الرسولية و السنة النبوية رؤية جديدة، (ص١٠٣)..

(٢) دليل القرآءة المعاصرة للتنزيل الحكيم، محمد شحرور، دار الساقي، بالإشتراک مع مؤسسة الدراسات الفكرية المعاصرة، بيروت-لبنان، الطبعة الأولى: ٢٠١٦م، (ص٥٤)..

لێ نەزانی بێت، بێگومان گەیاندنی بەڵگەی خوایی بەم شێوەیە ناچەسپێت لەسەر خەڵک، لە کاتێکدا پەروەردگارمان دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡۖ﴾ (١) واتا: «هەرگیز پەیامبەرێکمان نەناردووە بۆ نەتەوەیەک بە زمانی خۆیان نەبوویێت بۆئەوەی پەیامەکەیان بەجوانی بۆ ڕوون بکاتەوە.» دەی ئاشکرایە قورئانی پیرۆز بە زمانی عەرەبی نازڵ کراوە، پەیامهێنیش کەسێکی عەرەب بووە، بۆئەوەی پەیامەکە ڕوون بکاتەوە بۆ نەتەوەکەی خۆی لە سەرەتاوە (دواتریش بۆ زمانەکانی تر بەهۆی وەرگێڕ و وەفد و بانگخوازەکانەوە گەشت)، کەواتە مەبەست لە ناردنی پەیامی خوایی ڕوونکردنەوەیە نەک تەنیا خوێندنەوە، چونکە (البیان، لِيُبَيِّنَ ): بریتییە لەوەی کە باسەکە خۆی لە خۆیدا ڕوون بێت بۆ هەرکەسێک کە بیەوێ لێی تێبگات.(٢) وشەی (الإبانة و التبین ): کردارە بۆ ڕوونکردنەوە، ئەویش بریتییە لە دەرکردنی بابەتێک لە حاڵەتی لێتێنەگەیەنراویی بۆ حاڵەتێک کە هەقیقەتەکەی ئیمکانی تێگەشتن لێی ئاسایی ببێتەوە.(٣) جا کاتێک شتێک پێی دەوترێت: (مبین = ڕوون)، واتا: گونجاو بەجوانی و ئاسانی لە هەقیقەتەکەی تێدەگات، لەبەر ئەمەش پەروەردگارمان دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ ۖ وَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ ۚ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ ۗ﴾ (٤). واتا: «ئەی نێردراوی خوا ئەوەی بۆت نازڵ کراوە بیگەیەنە بە خەڵک، ئەگەر وانەکەی پەیامی پەروەردگارت نەگەیاندووە، هەر پەروەردگارتە کە لە خەڵکی پاراستووتی.»

---

(١) سورة [إبراهيم: ٤].

(٢) الإحكام في أصول الأكحام، علي بن أحمد بن سعيد بن حزم الأندلوسي أبو أحمد، دار الآفاق الجديدة، بيروت-لبنان، ١٤٠٣هـ-١٩٨٣م، (٤٠/١)..

(٣) الإحكام في أصول الأحكام، (٤٠/١).

(٤) سورة [المائدة: ٦٧].

هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ﴾[(١)] واتا: «بە وەحی خوایی فەرمانم پێکراوە کە هۆشداریتان بدەمێ بەم قورئانە و بۆ ئەوانەشی کە پەیامی قورئانیان پێ دەگات.» جا هۆشداریدان بە قورئانی پیرۆز کاتێک بەرجەستە دەبێت کە خەڵکەکە لێی تێبگەن و گەیەنەرەکەش بەجوانی تێیگەشتبێت و گەیاندبێتی. نەک زۆرینەی زۆری پەیامەکە هیچ ڕوون نەبێت کەچی گەیاندنەکەی بەرجەستە ببێت وەکوو شەحروور وتی!

پەروەردگارمان دەفەرموێت: ﴿وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾[(٢)] واتا: «بێگومان پەیامان بۆ نازڵ کردوویت بۆئەوەی هەرچییان بۆ دەنێرین بۆیان ڕوون بکەیتەوە و بەڵکوو ئەوانیش بیرێک بکەنەوە.»

کەچی شەحروور جاڕی ئەوە دەدات کە تێگەیشتن و تێفکرین لە قورئان دراوە بە خەڵک و پەیامبەر (ﷺ) مافی ئەو تێگەشتنەی پێ نەدراوە، گوایە مافی ڕاڤە و شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی نەبووە، چونکە شەحروور خۆی لە گێلی دەدات لەبارەی بنەمای (الاستفسار: داوای ڕوونکردنەوە) کە لەلای (أصولییەکان بریتییە لە: داخوازی هێنانی مانا و واتای هەر وشەیەک کە لە پەیامێکدا ناڕوون و شاراوە بێت.)[(٣)] چونکە لەڕاستیدا پەیامبەر (ﷺ) هەندێک ئایەتی کە تەفسیر نەکردبێت تەنیا لەبەر ڕوونی و ئاشکرایی بووە نەکە لەبەر ئەوەی خۆیشی لە ئایەتەکە نەگەیشتبێت! بەڵکوو لەبەر ئەوە بووە کە ئایەتەکە تەواو ڕوون بووە لەلایەن گوێگران و خەڵکەوە، بە بەڵگەی ئەوەی

---

(١) سورة [الأنعام: ١٩].

(٢) سورة [النحل: ٤٤].

(٣) الموسوعة الفقهية، وزارة الأوقاف والشوؤن الإسلامية-كويت، طباعة: ذات السلاسل-كويت، الطبعة الثانية: ١٤٠٦هـ-١٩٨٦م، (٥٩/٤)..

نە کێشەیان هەبووە و نەپرسیاریشیان کردووە تا پەیامبەر (ﷺ) بۆیان ڕوونتر بکاتەوە، ئاخۆ خودی پەیامبەر(ﷺ) چۆن لێی تێنەگەشتووە؟ وەکوو شەحروور بانگەشەی بۆ کرد!

پاشان ئەم کابرایە بانگەشەی ئەوە دەکات کە قورئانی پیرۆز بەجوانی باسی کۆرپەلەزانی کردووە، کەچی دەڵێت پەیامبەری گەیەنەری قورئانەکە تێی نەگەشتووە، جا خۆ بەم پێوەرەی شەحروور بێت تەنانەت زانایانی فیزیا و زیندەوەرزانیش دەبێت واز لە وردەکاریی خۆیان بهێنن و شوێن ئەم بنەما سەمەرانەی شەحروور بکەون بۆ گەیشتن بە هەقیقەتەکان، جا ئەگەر گەیشتن بە شتێک بەپێی ماندوبوونی خۆیان لە دەرەوەی قورئانی پیرۆز ئەوا گەیشتوون بە زانستی سروشت، بەڵام ئاخۆ شەحروور بەم بنەما بێمانایانەی خۆی هیچ بەرهەمێکی دەست مرۆڤایەتی خستووە؟ هیچ دۆسیەیەکی شیکار و چارەسەر کردووە؟! یان هیچ بەرهەمێکی نییە!

لەڕاستیدا ئەم هەموو هەوڵە تێکەڵەوپێکەڵەی داوە بۆ ئەوەی ڕێگە خۆش بکات لەژێر بیانووی ئیجتهاددا، تەنانەت ئەگەر پێچەوانە و دژی فەرمووده و وتە و تێگەشتنی زانایانی ئیسلام وەستایەوە لێی نەگیرێت، چونکە شەحروور پێی وابوو جوانترین تەفسیر لای داروینە مادام بەدوای هەقیقەتدا گەڕاوە و شەحروریش پێیوایە تیۆرییەکەی ڕاستە، ئیتر ڕەوایە بەلایەوە کە هەموو موسڵمانان نەزان بووین بە پەرتووکەکەی پەروەردگار، ئەگەر چی هەموو تەمەن و هەوڵ و تێکۆشانیان خەرجکردبێت لەو هەموو سەردەمانەی ڕابردوودا، لەولاشەوە داروین بەبێ ئەوەی لە یەک وشەی قورئان تێبگات، نە زمانی قورئان نە خوێندنەوە و تەنانەت ئیمانیشی پێی نەبوویێت، بەڵام توانیبێتی باشترین تەفسیر بۆ ئایەتەکان بکات! هاتووە دەڵێت: "باشترینی ڕاڤەکاران داروینە!" بەبێ ئەوەی وشەیەک لە داروینەوە هاتبێت کە بڵێ هەوڵی تێگەشتن و ڕاڤەی قورئانی دابێت، یان بۆی بگەڕێت و ملکەچی پەیامەکەی بێت!

تەنانەت ئیمان و باوەڕی بە پەروەردگاریش نەبووە،[١] ئاخۆ چ وێرانەیەکە بیری ئەم شەحرووره تا گەیشتووە بەم تێکەڵکردنە وێران و بێ سەروبەرە؟!

سەرباری ئەوەش دەڵێت: "گەورەترین هەڵەکاریی ئەوەیە کە ئێمە بمانەوێت بۆ تێگەیشتن لە ئیسلام لە سەدەی بیستەوە بگەڕێینەوە بۆ سەدەی حەوتەم لە شێوازەکانی بیرکردنەوەماندا."[٢] جا ئەم کابرایە نایەوێت ئیسلام بەو شێوەی پەیامبەر (ﷺ) هێناویەتی وەربگرێت، چونکە پەیامبەرمان (ﷺ) لە سەدەی حەوتەمی زایینی تەشریفی هاتووە بۆ جیهان! جا دەیەوێت وتەکانی بپێچێتەوە بە ڕێگەی دیبلۆماسی، دەڵێت: "ئێمە سەرزەنشتی ڕاڤەکارانی توراسی سەردەمەکانی حەوت و هەشت ناکەین لەوەی کە تێنەدەگەیشتن لە ئایەتەکانی قورئان، لەبەر نزمی ئاستی مەعریفەتیان."[٣]

خۆی لەڕاستیدا نەزانی و تێنەگەیشتنی داوەتە پاڵ پەیامبەرمان (ﷺ) کە لە زۆرینەی قورئانی پیرۆز تێنەگەشتووە، بۆیە ئەم تۆمەتەی کورت هەڵنەهاتووە لەسەر تەفسیرەکانی توراس وەکوو لەم بڕگەی کۆتاییەدا دەیڵێت، بەڵکوو شتێکی تریش هەیە ئەویش ئەوەیە شەحروور دەڵێت: "نەبوونی تێگەیشتنی زانایانی تەفسیر بەهۆی لەبارنەبوونی کەشی مەعریفییان بووە." بەمەش دوو ڕاستی ئاوەژوو کردووەتەوە:

١. زانستە قەتیسکراوەکان (سنووردیارەکان): وەکوو زمانی عەرەبی، زانستە شەرعییەکان کە کۆڕایی هەیە لەسەریان، بە چەشنێک کە لە هیچ چاخ و سەردەمێکدا شتێکی پەنهانی تازەی لێ دەرنەهێنراوەتەوە دوای چەسپاندنی،

---

(١) داروین بە باوەڕی (نازانم) مرد کە نە باوەڕی بە پەروەردگار هەبوو نە بێباوەڕ، انڤر: قصه حیاه تشارلز داروین، تحریر: فرانسیس داروین، ترجمه و مراجعه: مجدی محمود الملیجی، المرکز القورمی للترجمه، القاهره، ٢٠١١م، (ص٣١٦).

(٢) الکتاب و القرآن، (ص٥٦٦).

(٣) الکتاب و القرآن، (ص٥٦٦).

بۆ نموونە زانایەک نەهاتووە ئایەتێکی نوێ بدۆزێتەوە یان فەرموودەیەک پەیدا بکاتەوە کە پێشتر نەزانرابێت، یان باسێکی زمان کە عەرەب پێی ئاشنا نەبوویێت.

٢. زانستە ناقەتیسکراوەکان (سنووری دیاریان نییە): نموونەی زانستی: «گەردوونی، کیمیا، فیزیا، ئەندازیاریی» کە پسپۆڕییەکەی خودی شەحروورە، لەم زانستانەدا؛ ئەکرێ و ڕاستە کە شتانێکی نوێ بدۆزرێتەوە تێیدا کە پێشتر نەزانراو بن، دەشکرێ ئاشنا بن بە شتانێک کە پێشتر هیچ ڕوون نەبوویێت.

بەڵام شەحروور دەیەوێت زانستەکانی نموونەی یەکەم وەکوو نموونەی دووەم تەماشا بکرێت، بە دەستپێکی ئەوەی دەکرێ بووترێ لە بواری ئەندازییاریدا کۆمەڵێک شتمان دەستخستووە و دۆزیوەتەوە کە لە سەردەمی هاوەڵاندا نەزانراوە، کەواتە کەشی زانیاریمان فراوانترە لەوان و لەبەر ئەمەشە دەکرێت ئێمەشتانێک بزانین لە قورئاندا کە هاوەڵان نەیانزانی بێت، بەڵکوو تەنانەت پەیامبەریش (ﷺ) لێی نەزانی بێت، کە ئەمەش ئاوەژووکردن و تێکەڵاو کردنی دوو جیهانی جیایە، چونکە زانیاری و تێگەشتنی هاوەڵان بۆ زمانی عەرەبی فراوانتر و وردترە لە هەموو خەڵکێک کە دوای ئەوان هاتبێت، هەروەها تێگەیشتنیان لە قورئان و شەریعەتەکەی پەروەردگار و فیقهی حوکمەکانیش. بۆیە ئەستەمە ئەوان لە بواری ئاینی ئیسلامدا شتانێک نەزانن و دوای ئەوان ئاشکرا بکرێت، چۆن وا نەبێت لە کاتێکدا پەیامبەر (ﷺ) لە نێوانیاندا بووە و تێگەشتنیانی چەسپاندووە، ئەگەر کەسێکیشیان لە مەبەستی ئایەتێک تەواو نەگەشتبێت پەیامبەر (ﷺ) بۆی ڕاستکردووەتەوە، حوکمەکەشی بۆ ڕاست کردووەتەوە. بۆ نموونە لەو حاڵەتەی تێگەشتنی «عودەی کوڕی حاتەمی» ڕاست کردەوە بۆ ئایەتی ﴿وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ﴾ [البقرة: ١٨٧] واتا: «بخۆن و بخۆنەوە هەتاوەکوو هێڵی سپی لە هێڵی ڕەش جیادەکەنەوە لە بەرەبەیاندا، ئیتر ڕۆژووەکە بەردەوام

بکەن تاکوو ئیوارە.

عودەی (خودا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: ﴿لَمَّا نَزَلَتْ﴾: ﴿وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ﴾ [البقرة: ١٨٧]، (عَمَدْتُ إلِي عِقَالٍ أَسْودَ وإلَى عِقَالٍ أَبْيَضَ، فَجَعَلْتُهُما تَحْتَ وِسَادَتِي، فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ فِي اللَّيْلِ، فلا يَسْتَبِينُ لِي، فَغَدَوْتُ علَي رَسولِ اللَّهِ صَلَّي اللهُ عليه وسلَّمَ، فَذَكَرْتُ له ذلكَ، فَقالَ: إنَّما ذلكَ سَوَادُ اللَّيْلِ وبَيَاضُ النَّهَارِ).[1]

واتا: «کاتێک ئایەتەکە دابەزی پەتێکی ڕەش و پەتێکی سپیم هێنا و لەژێر نوێنەکەم دانابوو، کاتی پارشێو تەماشایانم دەکرد و نانم دەخوارد تاوەکوو ئەو کاتەی دەمتوانی لێکیان جیا بکەمەوە، بەڵام جوان بۆم جیا نەدەکرایەوە، ئیتر ڕۆشتمە خزمەتی پەیامبەری خوا (ﷺ) و باسەکەم بۆ کرد، ئەویش فەرمووی: بەڵکوو ئەوە جیاکردنەوەی هێلی ڕەشی شەوگارە لە هێلی سپێدەی بەرەبەیان.»

کەوابێت زانستەکانی شەرع جیاوازە لە پێشکەوتنی زانستەکانی فەلەکی و فیزیا و ئەندازیاری و هاوشێوەکانی، بۆیە هەرگیز ئەوە ڕوونادات کە هەر کاتێک لە زانستەکانی تاقیگە شتێکی تازە بدۆزنەوە خوایەکی تر بدۆزنەوە جگە لەوەی هاوەڵانی پەیامبەر (ﷺ) دەیانپەرست، هەرگیز ناگەن و نادۆزنەوە لە پەنهانییەک لە ئیسلامەتیدا کە زیاتر بێت لەو تێگەشتنانەی هاوەڵان هەیان بوو، بەڵام ئەو بابەتانەی کە هاوەڵان نەیانزانیوە لە بواری زانستەکانی دونیا و جگە لە هاوەڵان شتی تازە بدۆزنەوە؟ بێگومان ئەمە شتێکی ئاسایییە، بەڵام ئەم کابرایە دوو بابەتی تێکەڵوپێکەڵ کردووە، بۆئەوەی لەو تەمومژەدا بە بیانووی ئەوەی گوایە شارەزایە لە ئەندازیاریی، شوێنێک بۆ خۆی بکاتەوە لەنێوان زانایانی شەرعناسدا.

---

(١) صحيح البخاري، محمد بنإسماعيل البخاري، دار بن كثير، دمشق-بيروت، الطبعة الأولى: ١٣٢٣هـ-٢٠٠٢م، (ص٤٦١) حديث رقم(١٩١٦)..

بەڵکوو لە میانەی قسەکانیدا بانگەشەی ئەوەش دەکات کە شتانێک دەدۆزێتەوە کە پەیامبەرمان (ﷺ) و هاوەڵانیشی نەیانزانیوە، چونکە کەشی زانیارییان لەبار نەبووە بۆئەوەی لەو بوارەی شەرعەکەدا تێبگەن! ئاخۆ ئەمە بنەمای تازەیە کە شەحروور بانگەشەی بۆ دەکات؟ یان لە بنەڕەتدا مانای قسەکەی بریتییە لە داتاشین و هێنانی ئاینێکی سەرتاپا تازە؟

با ببینین خودی شەحروور چۆن وەڵامی ئەو پرسیارەمان دەداتەوە: "کۆتاهاتنی پەیامەکان و دەستپێکی چەرخی تازە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بریتییە لە دەمی دوای دابەزینی پەیامی خوایی لەبەر گشتیگیرییەکەی، چونکە وەکوو سەردەمێکی نوێ و هاندانێکی خوایی دەبینرێت بۆ مرۆڤایەتی، بۆئەوەی پشت بە خۆی ببەستێت لە دارشتنەوەی تەشریع و یاساکانی شەرعەکەدا." [1]

تەماشا بکەن، دەڵێت: "کۆتاییی سەردەمی دابەزینی پەیامی خوایی دەبێتە هاندانێک بۆ مرۆڤایەتی تا خۆبەخۆ دەست بکاتەوە بە تەشریعات بەپێی ویستی خۆی." جا ئەم کابرایە بانگەشە بۆ دارشتنی ئاینێکی تازە دەکات بە بیانووی تازەگەریی، بە بیانووی ئەوەی پەیامبەرمان (ﷺ) نەزان بووە بە زۆرینەی ئایەتەکانی قورئان، لەولاشەوە داروین باشترین ڕاڤەکارە بۆ هەندێک لە ئایەتەکانی قورئان، لەبەر ئەمەشە دەڵێت: "ئەو فیقهەی کە وەکوو میراتێک ماوەتەوە بە هەموو لق و پۆلەکانییەوە لە دروشمەکان و پەرستشەکان و لە تەشریعات و یاسادانان و عادەتەکان هەمووی پێویستی بە خوێندنەوەیەکی تازە هەیە، بۆئەوەی شکۆیەک بۆ ئیسلام بگەڕێنینەوە، سیفەتی جیهانگیریەکەی بۆ بگەڕێتەوە کە بەهۆی فیقە و فوقەهاوە لە سەرووی هەمووشیانەوە شافیعییەوە لە دەستی داوە، خوا بیانبوورێت." [2]

---

(١) السنة الرسولية و السنة النبوية رؤية جديدة، (ص١٤٠).

(٢) القصص القرآني: (١٥١/٢).

جا شەحروور دوژمنایەتییەکەی بەم نزا و پاڕانەوانە پەردەپۆش دەکات، ئەگینا بەو پەڕی بێ حورمەتییەوە تۆمەت و سووکایەتی بە ئیمان و دینداریی زانایانی ئیسلام دەکات، وەکوو دەڵێت: "فوقەها و ڕاڤەکارانی قورئان، پشتی پەیامبەرێتی موحەممەدیان شکاندووە!"[1] هەروەها دەڵێت: "فوقەها خۆیان کردووە بە شەریکی خوای گەورە لە حەرامکردنی شتانێک کە لە بنەڕەتدا حەلاڵە."[2]

جا بەم شێوەیە شەحروور دەرگا بۆ خۆی دەکاتەوە کە لە هەموو بابەتێکدا قسە بکات، دواتریش بڵێت: "ئەمە تازەگەرییە"، لەبەر ئەوەی بنەماکانی فیقهی و فیقهـ و فوقەهاش هەموو دادەڕوخێنێت، ئیتر وا نازانین پێویستی بە زمان و بنەماکانی زمانی عەرەبیش بمێنێت، بەو شێوەیە ئاینی ئیسلام هەموو مانایەکی وێران لە خۆ دەگرێت، دواتریش هیچ مانایەک بۆ ئیسلامەتی نامێنێت. ئەوەشمان بیر نەچێت ئەم ڕێوشوێنەی شەحروور تازە نییە، پێش ئەم پیاوانی کەنیسە هەوڵیانداوە بەرانبەر پەرتووکی ئینجیل ئەوها بکەن، ئەوەتا لە ئیجلیدا هاتووە کە کەسێک بە مەسیح (علیه السلام) دەڵێت: "ئەی مامۆستای چاکەکار، چ کارێک باشە بۆ ژیانی زیندەگانی؟ مەسیح وتی: "جا بۆچی پێم دەڵێی چاکەکار؟ کەس چاکەکار نییە جگە لە یەکێک کە ئەویش (الله)یە، بەڵام ئەگەر ویستت بگەیت بە ژیانی زیندەگانی ئەوا ئامۆژگارییەکان بپارێزە."[3]

لەم دەقەی سەرەوەدا سوودی ئەوە دەبینین کە بە دەقی ئینجیل دەسەلمێت کە مەسیح خوا نییە، یەکسانیش نییە بە خوا، چیرۆکی سێ خوا لە یەک

---

(١) الكتاب و القرآن، (ص٨٨).

(٢) الدين و السلطة، (ص١٨٧).

(٣) الكتاب المقدر، نداء الرجاء-شتوتغارت-ألمانيا، ترجمة: فانداياك البستاني، منقحة: ١٩٩١م، إنجيل متى، الإصحاح(١٩)، العددان(١٧-١٨).

مانادا ڕاست نییە، ئەگەرنا مەسیح لە وتەی پیاوەکە ڕازی دەبوو کە بەو ناوانە بانگی بکات، ئەوەشی کە لە وەڵامی ئەو پیاوەدا وتی، ڕێک مانای ئەوەیە کە هەرگیز مەسیح خوا نییە و لە پلەی خوایەتیشدا نییە، بەڵکوو مەسیح ئەو قسەیەی کرد "بۆ پێم دەڵێی چاکەکار؟" بۆ ئەوەی ڕێگری بکات لە زیادەڕەویی خەڵکی لە ئاستی مەسیحدا، دەبینین لە سوننەتی پەیامبەریشماندا هەمان نموونە هەیە، لەو فەرموودەی: (انطَلَقتُ في وَفد بني عامر إلى النبيِّ صلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ فقُلْنا: أنتَ سيِّدُنا. قال: السيِّدُ اللهُ تبارَكَ وتَعالى. قُلْنا: وأفضَلُنا وأعظَمُنا طَوْلًا. قال: قولوا بقَولِكم، أو بعضِ قَولِكم، ولا يَسْتَجرِيَنَّكم الشَّيطانُ..)[1] واتە: «کاتێک کە گرۆی نەوەکانی عامر هاتنە خزمەتی پەیامبەر(ﷺ)، وتمان: "تۆی سەروەر و شکۆدارمان." فەرمووی: "تەنیا (الله) سەروەر و شکۆدارمانە." جا وتمان: "باشترینمان و گەورەترینمانی." فەرمووی: "وتەی چاک بڵێن، یا هەندێک لەمانە، بەڵام وریای شەیتان بن پەلکێشتان نەکات بۆ زیادەڕەوی."

دەبینین زیادەڕەوی لا پەسەند نەبووە و ڕێگری کردووە لەوەی سەربکێشێت بۆ خراپتر. ئێستا دەپرسین، قەشەکان چۆن مامەڵەیان کرد لەگەڵ فەرمایشتەکەی مەسیحدا کە لە ئینجیلدا هاتووە؟

ئەمبروسیوس (ئەسقوف میلان) وەڵاممان دەداتەوە، (بێگومان کوڕەکەی خوا لێرەدا وەکوو مرۆڤێک دەدوێت، لە کاتێکدا لەگەڵ یەکێک لە نووسەرەکانیدا قسە دەکات، کە نووسەرەکە لەگەڵ خوادا قسە دەکات بە بڕگەی "ئەی مامۆستای چاکەکار"، بەڵام دان بەوەدا نانێت کە خوایە، بۆیە دەبینین نووسەرەکە بەوردی دانی بەوەدا نەناوە کە مەسیح خوایە و مەسیحیش هەستا

---

(١) خرجه أبو داود (٤٨٠٦) واللفظ له، والنسائي في ((السنن الكبرى)) (١٠٠٧٤)، وأحمد (١٦٣٥٩) باختلاف يسير والرواية: أخرجها أحمد (١٢٥٧٣) واللفظ له، والنسائي في ((السنن الكبرى)) (١٠٠٧٨) من حديث أنس بن مالك رضي الله عنه.

بە تێگەیاندنی، بەمەبەستی ڕێنیشاندانی بەرەو باوەڕهێنان بە کوڕەکەی خوا نەک بڵێت: "مامۆستای چاکەکار"، بەڵکوو پێویستە بڵێت: ئەی خودای چاکەکارم.)[1]

دەبین لە خودی ئینجیلدا پەیامبەر مەسیح (علیه سلام) دەربارەی خۆی ئاماژە بەوە دەکات کە مرۆڤە بە دانپیانانی ئەسقف لەسەرەوە، کەچی سەرباری ڕوونی قسەکە ئەسقف گوێ لە قسەی خودی مەسیحیش نادات و گرنگی بە حاڵی پیاوە پرسیارکارەکەش نادات، بەڵکوو بەپێی لێکدانەوەی خۆی شیکردەوە، نەک هەر ئەوەش بەڵکوو مانا هەڵەکەشی بەو شێوەیە داڕشتەوە کە خۆیان دوای سەردەمی مەسیح دایانتاشیوە کە مەسیح خودایە! ئاخۆ ئەمە هەمان ڕێگەی شەحروور نییە؟ لەسەر ئەو بنەمایەی کە دەقێکی ئاینیی بێژەری یەکەمی سەر زەوی کە پەیامبەرەکەیە (علیه سلام) لێی تێنەگەشتووە، ئەو خەڵکەشی پەیامەکەیان ڕاستەوخۆ لە پەیامبەرەکەوە بیستووە هیچی لێ تێنەگەشتوون، بەڵکوو دوای چەندین سەدە کەسانێکی دوور لە سەرچاوە و سەردەمی پەیامەکە لێی تێدەگەن، چونکە کەشیان لەبارترە بۆ تێگەشتنی پەیامەکە؟! هەتا وای لێ حاڵیی دەبن وشەکانی پەیامەکە مانایەکی پێچەوانەی دهقەکانی دەبەخشن! وەکوو چۆن ئەسقف وتی: مەسیح مەبەستی ئەوە بووهکهخۆی خودایە مادام فەرمایشتی مامۆستای چاکەکاری پەسەند نەکرد و وتی: "تەنیا خودا چاکەکارە!"

بەم ڕێوشوێنە بۆ شەحروور ئاسان دەبێت هەرچی بە مێشکیدا هات بیڵێت، و دواتریش قوڕاتی ئەوە لێ بدات و بڵێ: "ئەوانەی پێش ئێمە لە قورئان تێنەگەشتوون!"جا لەسەر ئەم بنەما سەقەتەی دەروازەی لەسەر خۆی فراوان کرد تاکوو هێرشەکانی بگەیەنێتە سەر زانایانی زمانەوانی، ئەوەش لەبەر

---

(١) شرح الإيمان المسيحي، أمبروسيوس (أسقف ميلان)، ترجمة: نصحي عبدالشهيد، المركز الأرثوذكسي للدراسات الآبائية، القاهرة، ٢٠٠٥م، الكتاب الثاني: (فصل١: فقرة١٧).

ئەوەی پێچەوانەی بۆچوونەکانی شەحروورن لە بابەتی سزای داوێنپیس، دەڵێت: "ڕاڤەکاران و زانایانی زمانناس و خاوەنی فەرهەنگەکان بەچەشنی ڕووکەشانە لە بابەتەکانیان ڕوانیوە وئەم چەشنەی کە مانای وشەکان بە حەقیقی وەردەگرێت و نکۆڵی مەجاز دەکات هۆکاری داخستنی دەرگاکانە لە بەردەم موفەسیر و فوقەهادا."[1]

ئەهلی زمانی عەرەبی لە زمانی خۆیان تێنەگەیشتبوون، هەتا جەنابی شەحروور هات و پێانی گووت هەڵەتان کردووە، هۆکارەکەشی ئەوەیە ئینکاری مەجازییان کردووە،[2] سەمەرەی شەحروور لەمەدایە کە نکۆڵی و سەرزەنشتی خاوەن زمانەکە دەکات لە شتێکدا کە خۆیان زۆر لە شەحروور شارەزاترن تێیدا، زۆرینەی زانایانی زمانی عەرەبی و بەلاغەت و ئوسوڵ ڕایان وایە کە لە زماندا مەجاز هەیە،[3] بەمەش دەرکەوت پێچەوانەی بانگەشەکەی شەحروور دەڵێن، ڕوونیشە ئەوان لە زمانەکەدا لە لوتکەی تێگەشتندان، گەرچی هەندێک لە زانایان نکۆڵی مەجازیان کردبێت وەکوو ئیبن تەیمیە، کە ئەمیش پێشینی هەیە لە زانایانی زمانەوانی عەرەبی،[4] لێرەشدا؛ نکۆڵی مەجازییان بەو مەبەستە نییە کە مانای وشە بۆ ئاراستەی تر نەچێت، نا، ئەوە هەیە و

---

(١) القصص القرآني قراءة معاصرة، محمد شحرور، دار الساقي، بيروت-لبنان، الطبعة الاولى: ٢٠١٢م، (٨٩/٢).

(٢) مەجاز = بابەتێکی ڕەوانبێژیە و لە زمانی عەرەبی و کوردیدا هەیە. مەجاز: بریتییە لە بەکارهێنانی وشەیەک بۆ مەبەستێکی تر، بەمەرجێک پەیوەندی هەبێت لەنێوان وشەمەجازییەکە و مانا مەبەستەکەدا، مەجاز سەر بەزانستی بەلاغەیە، بەشی زانستی بەیان. نموونەیەکی سادە: جادەکە چووەبەیەکدا (چووەبەیەکدا: مەجازە) بۆ وەسفکردنی لایەنی (قەرەبالغی شەقامەکە) بەکارهاتووە چونکە لەنێو خەڵکدا دەربڕینی مەجازی بەکار دێت. (وەرگێر).

(٣) انظر: الحقيقة و المجاز في الكتاب و السنة و علاقتهما بالأحكام الشرعية، حسام الدين موسى عفانة، إشراف: ياسن الشاذلي، جامعة أم القرى/كلية الشريعة و الدراسات الإسلامية (رسالة ماجستير: ١٩٨١-١٩٨٢م)، (ص١٠١).

(٤) انظر: الفتاوى و الرسائل الصغرى، أحمد الغماري، جمع و ترتيب: عبدالله التليدي، الطبعة الأولى: ٢٠٠١م، (ص١١٠).

هاوڕان، بەڵام مەبەستەکە ئەوەیە کە لە مەجازدا ڕەچاوی ڕستە و دەربڕینەکە و هەڵبەستەکانی دەق بکرێت بۆئەوەی بگەین بە حەقیقەتی مانا و مەبەستی گوفتارەکان،[١] کە ئەمەش هیچ کات نابێتە ڕوونکاریی بۆ بۆچوونەکەی شەحروور، چونکە شەحروور شەرم ناکات و درۆ هەڵدەبەستێ بۆ ئەوانەی ڕاجیای هەیە لەگەڵیاندا، وەکوو وتمان زۆرینەی زانایان فەرمایشتیان بە هەبوونی مەجاز کردووە کەچی شەحروور دەڵێت: نا، نا، بەڵکوو نکۆڵی دەکەم مادام باوەڕیان بە بەردبارانی (ڕەجم)ی داوێنپیس هەیە!

لەڕاستیدا؛ ئەو زانایانەشی کە دەفەرموون مەجاز هەیە لەگەڵ ئەو زانایانەی بە چەشنێک نکۆڵی دەفەرموون، هەموو بە تێکڕا هاوڕان لەسەر ئەو بنەمایەی کە (بنەوا لە وشەکاندا حەقیقەتی ماناکەیەتی) مەگەر بە هۆیەک لابدات، بەم پێیەش دەگەین بەوەی کە (مەجاز لقێکە لە حەقیقەت، چونکە لە بنەڕەتدا بەکارهێنانی وشە بۆ حەقیقەتی ماناکەی دانراوە، بەڵام مەجاز بۆ بەکارهێنانی مانایەکی تر بەهۆی وشەیەکی ترەوەیە، ئەمەش لەبەر هەبوونی پەیوەندیی ماناکاریی لەنێوان حەقیقەت و مەجازی وشەکەدا.)[٢] بۆیە ئەو زانایانەی لەگەڵ ئاسایی بوونی مەجازدان، ڕایان وایە کە ڕووکەشی ماناکان لار ناکرێنەوە بە مەبەستی ڕۆچوون بۆ قووڵاییەکی ناپەسەند و ناخگەرایی و ناخکاریی،[٣] بە مەبەستی داڕوخاندنی ڕووکەشی حەقیقی

---

(١) انظر: الحقيقة المجاز، أحمد ابن تيمية، تحقيق: محمد بن حامد بن عبدالوهاب، دار البصيرة، الإسكندرية، (ص٣٩).

(٢) الإشارة إلى الإيجاز في بعض أنواع المجاز، عزالدين عبدالعزيز بن عبدالسلام، دار المعرفة، بيروت-لبنان، (ص١٨).

(٣)الباطنييە: بیرێکی نەنگە کە لەخۆوە مانای دوور دروست دەکەن بۆ وشەکان بە بیانوی مەجازەوە هەرچی واتایەک پێیان خۆش بێت دایدەنێن بۆ وشەکان، دانەیەکیان دەڵێت: "والتين والزيتون) واتا ئیمامی حەسەن و حوسەین!، لێرەدا و لە قسەکانی ئیمامی غەزالیدا مەبەست لەم بیرەیە و هاوشێوەکانییەتی کە دەڵێت باطنی یان ناخگەرا. (وەرگێڕ)..

شەریعەت، لەبەرئەمەیە کە ئیمامی غەزالی دەفەرمووێت: "جیاوازی هەیە لەنێوان دەربڕینی ڕووکەش بۆ ناخی وشەکان لەگەڵ تێبینیدان لە ماناکانی ناخی وشە لە ڕێگەی ڕووکەشی وشەکەوە بە چەسپاندنی ماناکانی ڕووکەش، بۆیە بەم وردەکارییە دەتوانیت پارێزراو بیت لە بیری ناخگەراکان."(١)

جا لێرەدا جیاوازی هەیە لەنێوان ئەوەی کە نکۆڵی مانای ڕووکەشی دەقەکان بکرێت بە بیانووی مەبەست و ناخگەرایی (باتنیەت) لەگەڵ ئەوەی مانا ڕووکەشییەکەی بچەسپێنرێت لەگەڵ هەبوونی تێبینی لەسەر مەبەستی وشەکان، بەبێ ئەوەی ببێتە هۆی لەناوچوونی مانا هەقیقییەکەی، ئەگەرنا ئەمکارانە سەردەکێشێت بۆ ڕێچکەی «باتنییەکان = ناخگەرایان» کە مانا ڕووکەشەکانی دەقەکانیان هێندە لاروخوار دەکردەوە تا لە ماناکەی دەردەچوو و دوور دەکەوتەوە، بە بیانووی گرنگیدان بە مەبەستی وشەکان، واتا ناخ و ناوەڕۆکی وشەکان، سەرباری ئەم نەنگییە گەورەیەی باتنییەکان، هەرگیز بە بیانووی مەجاز ئەم نەنگییەیان نەدەکرد، چونکە هێندە خوێندەوار بوون کە دەیانزانی بەلاڕێدا بردنی ماناکان لەگەڵ بنەماکانی مەجازدا نایەتەوە.(٢)

جا حاڵ و باری باتنییەکان گەشتە ئەو ئاستەی کە بڵێن: "دڵنیاین کە (الله) نە هەیە و نە نییە!"(٣) جا دوو بابەتی دژیەکیان پێکەوە کۆکردەوە بە بیانووی ئەوەی گوایە ئەمە وردترین مانایە بۆ بابەتی شایەتوومانی یەکخواپەرەستی بۆ (الله) سبحانە، ئەمەش دوای کەوتنە ژێر کاریگەریی ڕێسا شاراوەکانی ئەفلاتۆنی داهێنراو، (سەرباری ئەمەش نەیاندەوت ئەم تێگەشتنەمان لەلای

---

(١) إحياء علوم الدين، محمد الغزالي (أبو حامد)، وبذيله: المغني عن حمل الأسفار في الأسفار في تخريج ما في الإحياء من الأخبار، عبدالرحيم بن الحسين العراقي، دار إحياء الكتب العربية، فيصل عيسى البابي الحلبين القاهرة، (٦٢/١).

(٢) انظر: دامغ الباطلو جتف المناضل، علي بن الوليد، تقديم و تحقيق: مصطفى غالب، مؤسسة عزالدين، بيروت-لبنان، ١٩٨٢م، (١٤٩/١).

(٣) انظر: دامغ الباطلو جتف المناضل (١٣٥/١).

زانایانی پێشیندا نەبووە کە بیریان بۆی نەچوویێت، بەڵکوو دەیاندایە پاڵ ئال و بەیتی پەیامبەر(ﷺ)، دەیانگووت: ئێمە بە میرات لە بانگەواز و بۆچوونی ئەوانەوە بۆمان ماوەتەوە.)[١]، چونکە دەیانزانی چەند ترسناکە بۆیان ئەگەر بڵێن ئەم بۆچوونانەمان تازەیە، چونکە ئەبووە دانپێدانانی خۆیان کە خەریکی بیدعەکارین لە ئیسلامەکەی خوای پەروەردگاردا، ئاخۆ ئەمە ئەگەر بیدعە نەبێت ئەی چییە؟! جا ناخگەرایی سەرباری ئەوەی بانگەشەیەکی خراپە و سەلەف و ئال و بەیت بە گومڕا و تێنەگەیشتوو لە قەڵەم دەدات، واش نیشان دەدات ئەمانە هاتوون و پەردەیان لەسەر شاراوەکانی ئیسلام لابردووە و کۆدە نهێنییەکانی دەقەکانیان ئاشکرا کردووە!

جا ئەم کابرایە (شەحروور) هاتووە هەنێک بنەمای تایبەت بە خۆی داناوە بۆئەوەی لە ڕێیانەوە لە (أصول و كلام أهل اللغة) چەسپاوەکان گوتاری خاوەن زمانیش دەرباز ببێت و نکوڵی هەرچی تێگەیشتنەکانی پێشینە بکات، جا دەڵێت: "هەموو زانستی پێشینمان بەلاوە ناوە و لە سفرەوە دەستمان پێ کرد."[٢] تۆ بڵێی لەسەرووی ئەم سفرەوە چ بەرهەمێکی هێنا بێت؟ جا دوای ئەم سفرە ئاسانە بۆی کە هەرچی عەلاجەوی هەیە بیڵێت لەژێر پەردەی توێژینەوە و لێکۆڵینەوە لە ڕێگەی مەجازەوە! دوای بانگەشەی لەناوبردنی زانستەکانی پێشین، وەکوو بڵێی ئەم شیعرە دەخوێنێتەوە بۆ شوێنکەوتووانی:

فها هو مات عنكم واسترحتم فعاطوا ما أردتم أن تعاطوا

وحلوا واعقدوا من غير رد عليكم وانطوى ذاك البساط[٣]

---

(١) تناقضات منهجية، نقد رسالة عدنان إبراهيم للدكتوراه، يوسف سمرين، مركز دلائل، الرياضالطبعة الأولى: ١٤٣٨هـ (ص١٢٣).

(٢) أم الكتاب محمد شحرور، (ص٢٠).

(٣) الجامع لسيرة شيخ الإسلام ابن تيمية خلال سبعة قرون، محمد عزيز شمس علي بن محمد العمران، دار عالم الفوائد، مكة المكرمة، الطبعة الثانية: ١٤٢٢هـ (ص٥٢٦).

واتا: ئەوەتا ئەو مرد و ڕزگارتان بوو لێی - جا ئێستا چیتان پێخۆشە بیڵێن و بیهێنن

ڕابخەن یان بپێچنەوە ڕێگرتان لە بەردەمدا نییە - خەمتان نەبێ چونکە ئەوی پێشوو پێچرایەوە.

تۆ بڵێی شەحروور چی بڵێت ئەگەر بنەماکانی خۆی بەکاربهێنێت و بۆچوونەکانی بخاتەگەر بە ناوی «ڕێسای بابەتە شەرعییەکان»؟

با لە گرنگترینیانەوە دەست پێ بکەین بزانین لەبارەی ئیمان بە خوا و ناو و سیفاتەکانییەوە چی دەڵێت؟

# هەڵوێستی شەحروور لەبارەی باوەڕبوون بە خوای گەورە و سیفەتەکانی

وەکوو ڕابوورد پێشتر کە شەحروور هەندێک پرتەوبۆڵەی کردبوو بەسەر ئوسوڵ و فیقهـ و زمانناسان و تەفسیرەکاندا، بێگومان پرتەوبۆڵەشی هەیە لەسەر ئەو باوەڕانەی کە جیاوازن لە بۆچوونەکانی، بۆیە بانگەشەی ئەوە دەکات کە ئەو بیروباوەڕانە بگۆڕدرێن تاوەکوو لەگەڵ شەحرووردا بێتەوە، جا دەڵێت: "پێویستە ئێمەی موسڵمانان بیروباوەڕەکەمان ڕاست بکەینەوە!"[١] ئێمە دەزانین کە گرنگی باسکردن و ڕوونکردنەوەی بیروباوەڕی ئیسلامی چەند گەورەیە! بەڵام ئاخۆ ئەو ڕاستکردنەوەیە چییە کە شەحروور هاواری بۆ دەکات لە بواری بیروباوەڕیی ئیسلامیدا؟

بێگومان شەحروور زۆر بە سانایی قسەکانی دەست پێ دەکات لە باسی بوونی خوای پەروەردگار لەسەر پێشەکییەکانی فەلسەفە کە بە بابەتە بنچینەییەکانی فەلسەفە ناسراون، کە بریتییە لە پەیوەندی ماددەکان بە فیکرەوە، پەیوەندی شتەکان (موجودات = بوون) بەهۆشی مرۆڤەوە، هەروەها پەیوندی هەستپێکراوەکانیش بە هەستپێنەکراوەکانەوە. جا دەڵێت: "گەورەترین کێشەی فەلسەفی بریتییە لە دیاریکردنی سنووری پەیوەندی نێوان بوونی شتە دیارەکان لەگەڵ وێنای بوونیان لە زهینی خەڵکیدا."[٢]

ڕاڤەی ئەوەش -بە پشت بەستن بە بنەماکانی فەلسەفەی ماددی- بەم شێوەیە

---

(١) القصص القرآني، (٢/١٥٦).

(٢) الكتاب و اقرآن، محمد شحرور، الأهالي للطباعة و النشر و التوزيع، دمشق-سورية، (٣٠، ٣١).

دەکات و دەڵێت: "پەیوەندی نێوان هۆش و بوونی ماددی بابەتێکی بنچینەیی فەلسەفییە، بێگومان ئێمە دەستمان بە دیاریکردنی ئەو پەیوەندییە کردووە کە سەرچاوەی مەعریفی مرۆڤایەتی بریتییە لە «جیهانی ماددی لە دەرەوەی زاتی مرۆڤایەتی»، ئەمەش واتا مەعریفەتی حەقیقی ناوەهمی: بریتیی نییە لە تەنیا ئەندێشەیەکی ئاوەز، بەڵکوو شتانێکی بەرجەستەی واقعی لە بەرانبەریدا هەیە، چونکە شتگەلێک لە دەرەوەی هۆشی مرۆڤ دەبێتە خودی حەقیقەت، لەبەر ئەمەیە ئێمە وتەی فەلسەفییە باڵاکان ڕەد دەکەینەوە کە دەڵێن: مەعریفەی مرۆڤایەتی تەنیا بریتییە لە دووبارە دارشتنەوەی بیرەکانی پێشوو."(١)

ئاخۆ بەم پێوەرانە بێت شەحروور چۆن تەماشای بوونی پەروەردگار دەکات لەسەر بنەمای ئەو دابەشکارییەی دەستی پێکردووە؟ ئاخۆ (الله) لای شەحروور بەرجەستەیەکی شیاوە بۆ هەست پێکردن؟ یاخود بوونێکی دەرەوەی ئاوەزی مرۆڤە؟ یان ڕەهایەکە کە بوونی نییە جگە لە بابەتێک لە زیهنی مرۆڤدا و وجودێکی حەقیقی نییە؟!

---

(١) الكتاب و القرآن، (ص٤٢).

# هەڵوێستەی شەحروور لەمەڕ بوونی (الله) سبحانه وتعالی:

شەحروور دەڵێت: "باوەڕبوون بە خوا لای من (شەحروور) بریتییە لە ملکەچی، منیش ملکەچم بۆ بابەتی بوونی خوا و ڕۆژی دوایی، ئەمەش چەسپاوە، چەسپاویش بابەتێکە کە بە هیچ شێوەیەک ناکرێ ڕوونکردنەوەی بۆ بدرێت، هەرچۆن ناتوانرێت بە زانستیش پۆچەڵ بکرێتەوە، بۆیە ناگونجێت کە مولحیدێک کە نکۆڵی لە بوونی خوا دەکات بڵێت: من مولحیدم چونکە مولحیدبوون هەڵوەستەیەکی زانستییە! هەروەها ناشبێت باوەڕدارێک بە بوونی خوا بڵێت: من باوەڕدارم چونکە باوەڕداریی هەڵوەستەیەکی زانستییە! بۆیە لای من هەردوو لایەنی باوەڕ و ئیلحاد دوو بابەتن کە مرۆڤەکە خۆی هەڵیدەبژێرێت بۆ خۆی."(١)

جا دەوترێت: ئەگەر مەبەستی لە ڕوونکردنەوەی زانستی بریتی بێت لە پشکنین و تاقیگەیی، خۆ پەرتووکەکانی خۆی خاڵین لێیان. بەمەش واتا دانیناوە بەوەیدا کە خۆی کەسێکی زۆر نازانستییە. دانیش بەوەدا بنێت کە لە هیچ دێڕێکیدا نە بەڵگە و نە بورهانێکی نەبووە لە پەرتووکەکانیدا، ئەمەش گرێی فیکرییە کە بێیت بنەماگەلیک دابنێیت و بڵێیت هەرچی لەگەڵ زانستی تاقیگەدا نەهاتەوە وەری ناگرین، دەی هەمان پێبەندی فەلسەفی دەبێت نەک نازانستی، بەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بنەمای یەکەم و هەڵدەوەشێتەوە.

---

(١) الإسلام الأصل و الصورة، محمد شحرور، طوى للنشر و الثقافة و الإعلام، لندن، الطبعة الأولى: ٢٠١٤م، (ص٥).

خۆ ئەگەر مەبەستی لە برگەی «زانستی» لەو مانایەی سەرەوە فراوانتر بێت کە بەڵگە عەقڵییەکان بگرێتەوە، ئەوا لێرەشدا؛ ئەوەی شەحروور دەیڵێت تەنیا و تەنیا دووبارەکردنەوەی وتەی «ئیمانوێلا کانت»ە، چونکە هەر کاتێک کە کانت لەڕوانگەیەکەوە دەستی کردبێت بە توێژینەوە لەبارەی خواوە لە دەرەوەی توانای عەقڵ بۆئەوەی لاهووتی لا بەرجەستە ببێت و لە هەموو ڕەخنەیەک بە دوور بێت، لە ڕوانگەیەکی ترەوە دەرگاکانی بەڵگە هێنانەوەی عەقڵی لە خۆی دادەخست، هەمیشە لە کۆتاییدا پابەندی بنەماکانی خۆی دەبوویەوە، دەریش دەکەوت کە ئەستەمە سەلماندنی بوونی خوا تەنیا لە ڕووی عەقڵەوە بێت، هەمیشە ڕێگەکەی چەند دەبووە بەڵگە بەدەستییەوە هێندەش بەڵگە بوو بەسەر خۆیەوە، جا لە هەندێک ڕوانگەوە هەڵدەستا بە بچووککردنەوەی عەقڵ بۆئەوەی بێ سنووری نەکات بەسەر خواوە بە ڕەخنەگرتن، ئەمەش بە بیانووی ئەوەی کە هەستەوەرەکان درک بە خوای گەورە ناکەن، کەچی لە ڕوویەکی ترەوە تووشی ڕێگری دەبوو لە ڕەهایەتی عەقڵ بۆ سەلماندنی بوونی خوا.(١)

هەموو مانای قسەکانیشی ئەوەیە کە بەڵگەکانی باوەڕدار و مولحید هاوتای یەکن، ناشتوانرێت ڕاست و چەوتیان لێک جیابکرێتەوە، پاشان لە ڕووی بەڵگەهێنانەوە و زانستەوە هەردوو لایەن تەریب دەڕۆن و یەکسانن، بۆیە هیچ تەوفیرێکی نییە چ ئیمان بێت یان ئیلحاد.

بەڵام قسەکەی «کانت» تەندروست نییە، چونکە عەقڵ لە توانایدا هەیە کە هەق لە باتڵ جیابکاتەوە، ئەو بنەمایەش کە «کانت» کردوویەتی بە پێوەر هەرگیز ناچەسپێت، لەبەر ئەوەی بانگەشەکەی دەڵێت: "خودا بابەتێکە کە هەستی پێناکرێت!" لێرەدا کات ناکوژین بۆ پوچی قسەکەی، بەڵام ئەوە دەڵێین کە کانت ئەم قسە پوچەی لە لاهووتی کڵێساوە وەرگرتووە، دواتر فەلسەفەکەی

---

(١) موقف ابن تيمية من المعرفة القبلية و شيء من آثاره الفلسفية، يوسف سمرين، إشراف: سري نسيبة، جامعة القدرس، فلسطين، (رسالة ماجستير/ ٢٠١٧م)، (ص١٨).

لەسەر ئەو قسە پوچە بوونیات ناوە بۆئەوەی لاهووت ڕزگار بکات لە بەرانبەر هەژموونی ڕەخنەکان، بۆیە هەر کارەکەی خۆی بوو بە ڕێگر لە بەردەم بەڵگەکاریی بۆ سەلماندنی خوا، لەملاشەوە ئەوەمان لێ ڕوونە کە شەحروور هاتووە بەبێ هیچ بەڵگەیەک باوەڕ دابمەزرێنێت و دەشیکات بە هاوتای ئیلحاد، بەم شێوەش یەکسانیان دەکات، دووبارە تەماشای قسەکەی بکەن: "ناشبێت باوەڕدارێک بە بوونی خوا بڵێت: من باوەڕدارم چونکە باوەڕداریی هەڵوێستەیەکی زانستییە!"[١]

ئاخۆ ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە شحروور باسی بابەتی نازانستی دەکات؟ لە کاتێکدا هەر خۆی دەڵێت: "ئەو بەرنامەی کە ئێمە پشتی پێدەبەستین هەمووی بەندە لەسەر بنەما زانستییەکان."[٢] کەوابێت مەنهەجەکەی زانستییە، کەچی دەڵێت: "سەلماندنی خوای پەروەردگار بابەتێکی نازانستییە!" لەگەڵ ئەمەشدا شەحروور قسە لە بابەتەکانی ناو قورئانی پیرۆز دەکات کە بەشێکە لە سەلماندنی خوای پەروەردگار.

نازانم ئەم کابرایە ئاگای لە خۆیەتی چی دەڵێت؟!

بابەتەکە زیاتر بەردەوامە لەگەڵ شەحروروردا و دەڵێت: "پێویستە لەسەر باوەڕدار کە تۆسقاڵێک گومانی هەبێت بەرانبەر بوونی خوا و پێویستە لەسەر مولحیدیش کە تۆسقاڵێک گومانی لە ئیلحادەکەی خۆی هەبێت."[٣]

باشە ئەگەر بوونی خوای پەروەردگار لای شەحروور هەقیقی بێت، لەولاشەوە بوونی خوا بابەتێک بێت لە دەرەوەی زەین و ئاوەز، وەکوو خۆی وتی: "هەر

---

(١) الإسلام الأصل والصورة، (ص٥).

(٢) الإسلام و الإنسان من نتائج القراءة المعاصرة، محمد شحرور، دار الساقي، بيروت-لبنان، الطبعة الأولى: ٢٠١٦م، (ص٢٠٥).

(٣) دليل القرآءة المعاصرة للتنزيل الحكيم، (ص٦٠).

کەسێک نکۆڵی بوونی خوا بکات لوتبەرز و کەللە ڕەقە!" ئەی بۆ لێرەدا دەڵێت: "هەر کەس باوەڕی بە خوا هەیە پێویستە هێندەی تۆسقاڵێکیش بێت گومان بکات لە بوونی خوا، هەروەها پێویستە لەسەر نکۆڵیکار و لوتبەرزیش کە گومان بکات!" باشە ئەکرێ بیروباوەڕێکی هەقیقی بخەیتە جێی گومان و مولحیدەکانیش ناچار بکەیت بە گومان؟ یان ئەم شەحرووره لە بنەڕەتدا باوەڕی نییە بە هەقیقەتی بوونی خوا، باوەڕی بەوەش نییە کە بەڵگە عەقڵییەکان سەلماندویانە و لە دڵ و فیترەتی خەڵکیدا چەسپاوە، شەحروور هاتووە داوای گومانیان لێ دەکات لەبارەی بوونی خواوە! ئاخۆ شەحروور نازانێت کە یەکێک لە مەرجەکانی دامەزراویی ئیمان بریتییە لە «یەقین و نەبوونی گومان»؟[1] باشە قسەکانی شەحروور لەگەڵ ئەم فەرمایشتەی خوای پەروەردگاردا چۆن یەکدەگرنەوە کەدەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ ...﴾[2] واتە: «تەنیا ئەوانە باوەڕدارن کە باوەڕیان بە (الله) و پەیامبەرەکەی هێناوە و هەرگیز گومانیان لێ ناکەن.»

خۆ ئەگەر بوترێت: گومان هەنگاوێکە بۆ لێکۆڵینەوە و گەیشتن بە حەقیقەت، پێی دەوترێت: دەی کاتێک دەڵێیت بوونی خوای پەروەردگار حەقیقەتە کەوابێت باوەڕدار گەیشتووە بە مەبەست، خۆ ئەگەر گومان بوێت بە هۆکارێک بۆ گەیشتن بەم لوتکەی باوەڕە، ئێ گەیشت بە حەقیقەت و باوەڕ، ئیتر بۆ گومان بکاتەوە وەکوو شەحروور دەڵێت؟ لوتکەی باوەڕەکەی تێکبداتەوە ئەگەر بە تۆسقاڵێک گومانیش بووە!

چونکە (گومان و دوودڵی لە باوەڕدا هەرگیز جێی سوپاس نەبووە بە کۆڕای موسڵمانان، بەڵکوو بابەتەکە هەمووی بریتییە لەوەی کە هەرکەسێک

---

(١) فتح المجيد شرح كتاب التوحيدن عبدالرحمن بن حسن بن محمد بن عبدالوهاب، حققه: عبدالقادر الأرنؤوط، مكتبة دار البيان، دمشق-بيروت، الطبعة الأولى: ١٩٨٢م، (ص٩١)
(٢) سورة [الحجرات: ١٥].

زانستی نکۆڵی یان سەلماندنی شتێکی پێ نەبوو ئەوا پێویستە بێدەنگی هەڵبژێرێت، خۆ ئەگەر کەسێک هەبوو زانا و تێگەیشتوو لە زانستی هەق بە بەڵگە خوازراوەکانی بەو شێوەیەی پەیامبەرمان (ﷺ) ڕوونی کردووەتەوە و زاناکەش شوێنی پەیامبەر (ﷺ) کەوتبێت لە بابەتەکەدا، ئەوا بۆ کەسی نەزان و سەرلێشێواو نییە نکۆڵی و ملەجەڕێ بکات لە دژی زانایەکی تێگەیشتووی پێش چاو ڕوون، بەڵکوو پێویستە لەسەر شانی نەزانەکە گوێڕایەڵ و ملکەچی فەرمایشتەکانی زاناکە بێت، چونکە لێزانە لە زانستەکانی مەعقول و مەنقولەکان)[١]، ئیتر چۆن دەکرێ بوترێ پێویستە لەسەر هەردوولا کە گومان بکەن لە بوونی خوا؟

لێرەدا پرسیارێک زەق دەبێتەوە: باوەڕەکەی شەحروور بە خوای گەورە بەبێ بەڵگە چۆن وای لە شەحروور کرد کە ئاوەزیی بوونی خوا بکات؟ لە کاتێکدا خۆی دەڵێت: "(الله) لە خودی خۆیدا بریتییە لە تەنیا بوونێک، واتە هەبوویەکە کە خۆی هەیە و تەواو."[٢]

لیرەدا شەحروور تیۆرییەکەی خۆی بەڕاشکاوانە دەخاتە ڕوو لە بابەتی بوونی خوا و دەڵێت:

"بوونی شتێکی دانراو لە دەرەوەی ئاوەز بریتییە لە بوونی خوا."[٣]

جا بوون لە دەرەوەی ئاوەز بریتییە لە بوونی خوا لە تیۆری شەحروردا، لە کاتێکدا ئەم وتە گشتگیرە مانای ئەوە دەبەخشێت کە هەموو بوونێک لە دەرەوەی ئاوەزی مرۆڤ دەبێتە خوا، لە هەمان کاتدا خوای میهرەبان بوونێکی

---

(١) القاعدة المراكشية، ابن تيمية، تحقيق: ناصر بن سعد الرشيد - رضا بن نعسان معطي، مطالع الصفا-مكة المكرمة، ١٤٠١هـ (ص٥٥).

(٢) نحو أصول جديدة للفقه الإسلامي، (ص٣٧).

(٣) الكتاب و القرآن، (ص٧٢).

دانراو نییە لە دەرەوەی ئاوەز، بەڵکوو هەرچی شتێک بوونی هەبوو لە دەرەوەی ئاوەز لای شەحروور بریتییە لە بوونی خوداوەند!

خۆ بەم پێوەرەی شەحروور بێت پیسییەکان و قیزەونییەکان و شەیتانەکان و کافران و هەرچی شتێک لە هەق و لە باتڵ لە بووندا بوونی هەیە، هەمووی بریتییە لە بوونی خواوەند، کەوابێت قسەکەی شەحروور لە قسەی گاورەکان زۆر نەنگ و نەگریسترە، چونکە گاورەکان نکۆڵی ئەم جۆرە قسانەیان کردووە و دەپرسن: "ئاخۆ دەکرێت بەدیهێنەر لەگەڵ بەدیهێنراوەکانیدا هەژمار بکرێت؟ چۆن دەکرێ بەو پێوەر و پێوانە باسی بکەیت کە وەکوو بەدیهێنراوەکان بێتە پێش چاو لە کاتێکدا خۆی هەموویانی بەدیهێناوە؟"[١]

هەرچەندە ئەمە پێبەند نییە بۆ شەحروور تا بڵێت: "من پێبەندی ئەم قسانە نابم." پێنبەندی بۆچوونەکان بریتی نین لە خودی بۆچوونەکە! بەڵکوو هەڵوێستەی شەحروور لەبارەی قورئانی پیرۆزەوە مەبەستەکانیمان بۆ ڕوون دەکاتەوە.

با بچینە بابەتی دواتر بۆ ئەم مەبەستە...

---

(١) شرح الإيمان المسيحي، (٣١/١).

## هەڵوێستەی لەمەڕ قورئانی پیرۆز:

موحەممەد شەحروور دەڵێت: "ئەگەر دەقی ئەو قورئانە خوێنراو و نووسراوەی بەردەستمان هەمان گوفتاری (الله) بێت مانای وایە خوا ڕەگەز و جەستەی هەیە، ڕەگەزیشی عەرەبە، وتەکانیشی وەکوو وتەی مرۆڤە کە لەسەر پەیوەندی نێوان بەڵگە و بەڵگە بۆهێنراو (دال و مەدلول) وەستاوەتەوە، جا لەبەر ئەوەی خوا تاقانەی چۆنییەتییە و تاکیشە لە چەندێتیدا و نە عەرەبە و نە ئینگلیزە پێویستە مانای قسەکانی لە بەڵگە بۆهێنراوەکاندا (مەدلولەکاندا) بەرجەستە ببێت، وشەی «خۆر» لای خوا خودی خۆرە، وشەی «مانگ» لای خوا خودی مانگە، وشەی «لوت» خودی لوتە، بەمانایەکی تر هەرچی بەدیهێنراوی ماددی هەیە لەگەڵ ناوەکانیاندا بە گشتی بریتین لە خودی کەلامی خوا."[١]

جا هەرشتێکی بەدیهێنراو لای شەحروور بریتییە لە قسەی (الله)، مانگ وتەی خوایە، خۆر و شەیتان و پیسایی، هەمووی کەلامی خوایە، کاتێک کەسێک پیسییەک لا دەبات ئەوە قسەی خوای لابردووە!

جا بە پێی وتەی شەحروور بێت ئەگەر وتەی خوا مەخلوق نەبێت ئەوا مانای ئەوەیە بوونیش مەخلوق نین، ئەمەش ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە موحەممەد شەحروور هەندێکجار وا هەڵسوکەوت دەکات کە (الله) وەکوو جیهانی بەدیهاتووە، هەندێک جاری تریش بەدیهێنراوەکانی جیهانی بوون وەکوو وتەی خوا دەبینێت، لەلایەکی ترەوە نکۆڵی ئەوە دەکات کە قورئانی پیرۆز بە زمانی عەرەبی بێت بەحساب نەبێتە هۆی دیاری کردنی ڕەگەز بۆ خوا، تا

---

(١) الكتاب و القرآن، (ص٧٢)، بإختصار يسير.

نەوترێت خوا عەرەبە مادام قورئانی بە زمانی عەرەبی نازڵ کردووە! بەڕاستی ئەم قسانەی شەحروور ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە نە زمانەکە و نە فەلسەفەش هیچی لێ نازانێت، چونکە (الله) باوانی نییە و وەچەشی نییە، هیچ شتێک لە نموونەی ئەو نییە، کە قورئانی بە عەرەبی فەرمووبێت هەرگیز مانای ئەوە نییە لە وەچە و ڕەگەزی عەرەب بێت، چونکە عەرەب باوان و وەچەن.

بەهەمان شێوەش بۆ بەدیهێنراوەکانی خوا، هەرگیز ناوترێ ئەمانە وتەی خوان! چونکە قسەکردن سیفەتێکە بۆ خاوەنەکەی کە قسەکار و خاوەنی وتەکانە، جا شەحروور بەدیهێنەری تێکەڵ کردووە لەگەڵ بەدیهێنراوەکانیدا، چونکە فەرمایشتی خوا سیفەتێکی خوایە، نەک بڵێی مادام مەخلوق قسە دەکات، کەواتە قسەکردن موڵکی مەخلوقە و خالق نابێ قسەی هەبێت، لەولاشەوە بڵێی هەموو بەدیهێنراوەکان بریتین لە قسەی خوا! بەم پێیەیش شەحروور سنووری بیری گرۆی (وحدة الوجود)ی ڕابردووی تێپەڕاندووە، سا (ئیبن عەرەبی الطائی) کە لە سەرانی (وحدة الوجود)ە دەیگوت:

**وكل كلام في الوجود كلامه　　　سواء علينا نثره و نظامه**

واتا: هەموو گوتەیەک لە بووندا گوتەی خوایە - لای ئێمە هاوتایە پەخشان یان هۆنراوە

جا ئیبن عەرەبی و هاوڕێکانی زۆر ژیرتر بوون لە شەحروور، چونکە هەموو وتەیەکیان دابوویە پاڵ پەروەردگار، نەک بڵێن هەموو بوونەوەران بریتین لە کۆمەڵێک وشە، ئەم وشانەش وتەکانی خودان، چونکە ئەمە تێکەڵەیەکی ڕوونە (سەفسەتەیە)، کە بوونەوەران بە وتە و بە گۆ مانا بکەیت، دواتریش ئەم وتانە بدەیتە پاڵ جگە لە بوونەوەرەکە، جا خۆ ئەگەر بوون (وجود) وتەی خوا بێت کە بوونی دەرەکییە بریتیی بێت لە بوونی پەروەردگار، ئەو کاتە وتەکان

دەبنە وتەی خۆیان نەک وتەی خوای گەورە!

هاتوهاواری نێو تەرزەکانی ئەم کابرایە بەڕوونی دیارە تێکەڵەیەکی کردووە لە مانای قسەکردنەکە سیفەتێکی سەربەخۆیە لەگەڵ شتە بەدیهێنراوەکان کە لە سیفەتی قسەکردن جیان، بەڵام ئەم هاتووە بوونەوەرانی بەدیهێنراو دەکاتە خودی خوا، دواتریش هەموو بوونەوەر دەکاتەوە بە کەلامی خوا، ئەمەش لەڕوویەکی ترەوە لە بۆچوونە نەنگەکانی گاورەکان دەچێت کە لە ئینجیلی یۆحەنا هاتووە: "بوون (وجود) لە سەرەتادا تەنیا وتە بووە، وتەش لای خوا بوو، بۆیە خواش تەنیا وتەیەک بوو."(١)

جا ئەوان لە ڕاڤەی ئەم دەقەدا دەڵێن: "ئەم وتانەش بریتیی نین لە کەلامی خوا کە گوێ کردبێت."(٢)

دەوترێت: زاراوەی (بوون = وجود) تەنیا بابەتێکی نێو ئاوەزی مرۆڤە لەبارەی بوونەوەرانی دیاریکراو کە لە واقعی دەرەوەی ئاوەزدان نموونەی خۆر و مانگ، جا ئەگەر هەموو بوونەوەران بریتی بن لە گوتەی خوا، ئەی خوا کوا؟ بەڕاستی لای ئەمانە خوا بوونی نامێنێت، چونکە بە بنەماکەی ئەوان بێت، بوونی خوا هەرگیز سەربەخۆ نابێت لە بوونەوەرانی تر، وەکوو پێشتر باسمان کرد کە شەحروور دەڵێت: "بوونەوەری بەدیهێنراو خودی بوونی خودایە."، جا بەراستی نازانم شەحروور ئەم بۆچوونە لەگەڵ قسەکەی تری کە دەڵێت: "بوونەوەر بریتییە لە بوونی خوا." چۆن دەگونجێنێت؟!

شەحروور دەڵێت: "(الله) ڕەهایە، وتەکەشی ڕەهایە."(٣)

دەوترێت: شتی ڕەها تەنیا لە ئاوەزدا هەیە، بۆ نموونە کاتێک دەڵێی:

---

(١) یوحنا، الإصحاح(١)، العدد (١).

(٢) شرح الإيمان المسيحي، (ص٤٢).

(٣) الكتاب و القرآن، (ص١٥٢).

«یەک» لە بیردا نرخێکی ڕووتە و خاڵییە لە هەموو سیفەتێکی دیاریکراو، بۆ شتێکی دیاریکراو، بەڵام ئەم «یەک»ە ڕەهایە، لە واقیعدا بوونی نییە، نە سیفەتە ڕەهاکانی بوونی هەیە و نەبوونێکی تایبەتی خۆشی، بە هەرحاڵ لەوەیە بوترێت: مەبەست لێرەدا لە وشەی ڕەها ئەوەیە بەرانبەر مانای ڕێژەیی بەکارهێنراوە، لە وەڵامدا دەوترێت: مەعریفەی ڕێژەیی وەکوو زانینی سیفەتی شتێکە بەبێ زانیاریی لەسەر هەموو لایەنی تری سیفەتەکانی، بۆیە مەعریفەی ڕێژەیی نابێتە دژەواتا بۆ مەعریفەی ڕەها، بەڵکوو بەشێکە لە مەعریفەی تەواو، بۆیە تاکوو زانیاریی ڕێژەیی ڕێژەکەی زیاد بکات ئەوە نزیکتر دەبێتەوە لە تەواوبوونی تێگەشتن لە بابەتەکە، جا هەرکەسێک خۆی تووشی هەڵەکردن بکات لە تێکەڵکردنی «مەعریفەی ڕێژەیی» وەکوو دژەواتای «مەعریفەی ڕەهایەتی» ئەوە تووشی هەڵەی لێتێکچوون بووە، لەوەی کە «زانینی تەواو لەسەر شتێک» دەکاتە دژەواتای «زانینی ڕێژەیی لەسەر شتەکە»، چونکە ڕاستییەکە ئەوەیە کە بەشێک لە زانیاریی هەرگیز دژی تەواویی زانیاری نییە لەسەر شتێک، بەڵکوو دەبێتە بەشێک لێی، تاکێکە لە هەموو بەشە گشتییەکەی، نەک بڵێی دژەواتایەتی.

لەسەر ئەو بڕگەیەی شەحروور دەڵێت: "ئێمە ڕێژەیین"[1] بەو هۆیەوە هەوڵدەدات ئاوەزی مرۆڤ بەڕێژەیی بچوێنێت، بەوەش بڵێت: "ئەشێ بکرێتە دژە واتای ڕەهایەتی"، جا دەڵێت: "قورئانی حەکیم دابەزێنراو ڕەهایە لە خۆیدا، بەڵام ڕێژەییە بەنیسبەت خوێنەرانییەوە، چونکە ڕێژەییەکەی شوێنی هۆکارەکانی پێشکەوتنی ئامرازەکانی مەعریفە دەکەوێت لەلایەن مرۆڤەوە."[2] لەمەشدا ئامانجی لێدانی زەمینی زانایانی پێشینەیە بۆ قورئانی پیرۆز، گوایە قورئان

---

(١) الكتاب و القران: (ص٤٦٩)

(٢) النص من على موقعه الرسمي:

(http://shahrour.org/?page_id=3)

ڕەهایە و زمینی ئەوانیش ڕێژەیی بووە، ئەوجا هەر شەحروور نەبوو وتی هەموو بوون بریتییە لە کەلامی خوا؟! دەی بەم پێوەرەی خۆیشی بێت ئێمە ڕەهاین، چونکە ئێمە هەین و کەلامی خواین کەواتە ڕەهایشین، بۆئەوەی کەسێک نەڵێت قسەی شەحروور وا لێک مەدەنەوە، قسەی خۆی دەهێنین کە دەڵێت: "(الله) حەقیقەتێکی هەبوویی ڕەهایە لە خودی خۆیدا، بێگومان هەموو بوون (مەوجودات) بریتییە لە حەقیقەتی ڕەها کە جگە لەخۆیدا هەن و بەویشەوە بەندن."(١)

کەوابێت هەموو ئێمە ڕەهاین، چونکە بەحەقیقی هەین، ئەی باشە بابەتی ڕێژەییەکەی چی بەسەر هات کە دەیویست خۆی لێ قوتار بکات؟!

لەگەڵ ئەوەشدا؛ کە قسەکەی ئیبن عەرەبی دووپات کردووەتەوە ئەگەر چی شەحروور وا خۆی پیشان دەدات کە ڕاجیایی دەکات لە ئیبن عەرەبی! جا دەڵێت: "ئیبن عەرەبی ئیسلامی کردووە بە سەمەرە و گاڵتەجاڕیی چونکە دەڵێت: لە پەرستنی پەستراوەکاندا هێشتا جگە لە (الله) نەپەستراوە."(٢)

ئەم کابرایە یان ئەوەتا نازانێ چی لە کەللەیەوە دێتە دەر، یان خۆی گێل دەکات لە قسەکانی! چونکە هیچ قسەیەکی نییە لەولاوە دژەکەی نەگوتبێتەوە، دەی ئەگەر بەقسەکەی ئەم بێت هەموو بوون بریتییە لە بوونی خوا و هەرکێ هەرشتێک بپەرەستێت ئەوە هەر خوای پەرستووە! دەی مەگەر بتەکانیش هەر بریتی نەبوون لە مەوجوداتی دەرەوەی زەین، کەواتە بتەکانیش بەشێکن لە بوونی ئیلاهی لە لای شەحروور، جا هەرکەسێک ئەو بتانەش بپەرستێت هەر (الله)ی پەرستووە! لە هەمووی سەمەرەتر ئەوەیە شەحروور ئەم قسانەی خۆی بیر دەچێتەوە کە کردوونی و بە ئیبن عەرەبی دەڵێت: "ئیسلامی

---

(١) نحو أصول جديدة للفقه الإسلامي، (ص٤٠).

(٢) الكتاب و القران، (ص١٣٣).

کردووە بە مەهزەلە و گاڵتەجاڕی!"

جا سەرباری ئەم چەواشەکارییە سەرپێیانەی شەحروور لە قوتابخانە فیکرییە جیاوازەکاندا دەیکات، هەوڵ دەدات کۆمەڵێک بنەما بسازێنێ و تەمومژێک بنێتەوە لەبەرچاوی خوێنەراندا، بۆئەوەی وا وێنا بکات کە کەسێکی وردە، تەماشا چی دەڵێت: "بۆئەوەی ورد و دەقیق بین نابێت بڵێین: (قال الله = خوای گەورە فەرمووی) لە بابەتەکانی ئەحکامدا، بەڵکوو دەڵێین: خوا فەرمانی کردووە کە نوێژ بکەین یان دەڵێین: فەرمانی کردووە بە ڕۆژوو گرتن، یان دەڵێین: (الله) فەرمانی پێکردووین بە ئەنجامدانی نوێژی هەینی لەم ئایەتەدا: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِىَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ فَٱسْعَوْاْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ...﴾[1] لێرەدا ناڵێین خوا فەرموویەتی ئەی باوەڕداران بچن بۆ نوێژی هەینی، چونکە ئەگەر بڵێین خوا وای فەرمووە، خەڵکێکیش هەبێت نوێژ ئەنجام نەدات، مانای وایە وتەی خوا جێبەجێ ناکرێت، کە ئەمەش دژەواتای ئایەتی (قوله الحق) دەبێت، ئەمە لە کاتێکدا کە زاراوەکان پێبەند بکەین بە زاراوەی قورئانی پوخت."[2]

شەحروور لێرەدا بە ڕوونی دەڵێت: "نابێت بڵێین خوای گەورە فەرموویەتی نوێژ بکەن، چونکە هەندێک خەڵکی نوێژ ناکە." کەچی هەر خۆی لە شوێنی تردا دەڵێت: "هەرچی گوتە هەیە بریتییە لە بوون، خواش هیچ شتێک ناڵێت مەگەر بوونی هەبێت، کەواشبێت هەرچی شتێک بوونی هەبێت بریتییە لە گوتەی خوا..." بەڵام شەحروور ئەم قسانەی خۆی لەبیر کردووە، کە دەڵێت: (جیهاد لە پێناو خوای گەورە بریتییە لە پشتیوانی لە ئازادی مرۆڤایەتی کە خۆی گوتەی خوایە و پێشتر گوتویەتی بۆ هەموو خەڵکانی سەر زەوی،

---

(١) سورة [الجمعة: ٩].

(٢) الكتاب و القران لا٧٨٧

ئەوەش بریتییە لە جیهادی پیرۆز لە شێوازە جیاوازەکانییەوە کە لە گوتەوە دەست پێ دەکات و بە کوشتار کۆتایی دێت، کە لە باوەڕی تاکەوە سەرچاوەی گرتووە و لەو سۆنگەیەوە مرۆڤ ئازادی دەردەبڕێت و پێداگیری دەکات لەسەر پاراستنی و پشتیوانیکردنی لە ئازادی خەڵکانی تریش ئەگەر لە هەرساتێکدا پێشێل بکرێت و سنوورەکانی ئازادی ببەزێنرێت لەلایەن بانگەشەکارانی ستەم و چەرمەسەرییەوە.)[1]

وەکوو بڵێیت لیرەدا کە دەڵێت: "ئەمەش دژەواتای ئایەتی (قوله الحق) دەبێت"، ئێستا ئەگەر بەراوردێک بکەین لەنێوان ئازادی و نوێژکردندا، بە یاساکەی خودی شەحروور بڵێین ئەوەی خودا بیلێت دەبێت ببێت و هەموو کەس بیکات وەکوو ئازادییەکە! دەی ئەگەر دەڵێت: "ناڵێین نوێژی هەینی بکەن وتەی خوایە، چونکە هەندێک خەڵک نوێژ ناکەن!" ئەی خۆ زۆر کەس ئازادی پێشێل دەکەن بە قسەی خودی شەحروور کە بە ستەمکار و چەرمەسەر ناوی هێناون! کەوابێت ئایا ستەمکاران و زاڵمان ڕێ دەگرن لە گوتەی خوا و ئازادی پێشێل دەکەن؟! نەک هەر ئەمەش مادام ستەمکاران هەن ئایا شەحروور بە هەق و گوتەی خوایان دەزانێت لەسەر ئەو یاسایەی خۆی کە وتی: "هەرچی هەبێت گوتەی خوایە، هەرچی گوتەی خوا بێت هەیە و هەقە!" ئەی هەر خۆی ناڵێت: گوتەی خوا ئازادیە؟ ئێ بەم قسەی خۆیشی بێت ستەم و زاڵمانیش مادام هەن دەبنە ئایەتی خوایی! ئاخۆ دەیەوێت بڵێت (گوتەی خوا = ئازادی) دژ بە (گوتەی خوا = ستەمکار) جیهاد دەکات؟! بەڕاستی ئەم کابرایە هەر دوو ڕستەی جوان و پوختی نییە! ئەڵێی لە کۆڕبەندی نێودەوڵەتیی چەند وڵات و زمانێکی جیاوازەوە و لە لوتکەی ململانێدا بڕگەی پچڕپچڕی هێناوە کە بە هیچ شتێک پێکنایەن، ئەم هەموو قسەلۆکەی هێناوە لە پەرتووکێکدا کۆی کردووەتەوە، دواتریش بە ئێمە دەڵێت ئەمە ئایینە، ئەمە بنەما تازەکانە

---

(١) الدين و السلطة لا ٤٥١

و خوێندنەوەی تەواوە، پێویستە موسڵمانان بە کاکیلەکانیان قەپی لێبگرن و کاری پێبکەن و پشت لە بنەکانی شەرع و فیقهی بەڵگە بکەن، چونکە ئەو بنەمایانەی هەن دەبنە پەرستنی جگە لە خوا! و توراس پەرستییە!

شەحروور بەوەشەوە ناوەستێ کە ئەم بیرە نەنگانە بۆ خۆی دابنێت، بەڵکوو دەڵێت: "ئێمەی موسڵمانان باوەڕمان بە هەقیقەتی بوونی خوا هەیە، باوەڕیشمان بە هەقیقەتی گوتەکانی هەیە کە بریتییە لە خودی بوونەوەران، کە هەردووکیشیان (خوا و بوون) لە دەرەوەی زەینی مرۆڤدان."[١]

جا بەڕاستی یان ئەوەیە جگە لە خۆی بە موسڵمان نازانێت و بەناوی ئەوانەی کە بە موسڵمانیان دەزانێت قسە دەکات، کە موسڵمانان واتە هاوبیرەکان، یان ئەوەیە درۆ دەکات کە دەڵێت: "موسڵمانان باوەڕیان وایە کە گوتەی خوا بریتییە لە بوون و مەوجودات." کە خۆر و مانگ و شەیتان و پیسەکان و بۆگەنییەکانیش دەگرێتەوە کە هەموویان لەژێر ناوی (بوون)دا جێگەیان دەبێتەوە! دەی خۆ ئەمە بیروباوەڕی موسڵمانان نییە، چونکە زانایانی ئەهلی ئیسلام (ئەهلی سوننەت) باوەڕیان وایە کە (فەرمایشتی خوا، ئەو گوتانەیە کە پەروەردگار خۆی فەرموویەتی، گوفتاری فەرمووە بە ویست و توانای خۆی، هەرگیز دروستکراو نییە و جیا نییە لە پەروەردگارمان، بەڵکوو سیفەتێکە لە سیفەتەکانی خوای گەورە و گوتەی خودی خوایە.)[٢]. کەواتە گوتەی خودایی بەشێکە لە زاتی خوا، ئەمەش ئەو ڕاستییە کە بەڵگەکانی ژیریی و دەقەکان پشتڕاستی دەکەنەوە، ئێرە شوێنی وردەکاری ئەو بابەتە نییە، دەکرێ بگەڕێنەوە بۆ پەرتووکی (التسعينية)ی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە.

لای ئەشعەرییەکانش: کەلامی خوا بریتییە لە (پەسنێکی ئەزەلی تایبەت

---

(١) الكتاب و القران لا ٢٦٤-٢٦٥

(٢) مجموع فتاوى ابن تيمية: (٥٦٦/١٢).

بە زاتی الله تعالی)،[١] هەر بەم شێوەیەش گرۆی ماتوریدی بۆچوونیان هەبووە،[٢] لای موعتەزیلەش: (گوتەی پەروەردگار لە ڕەگەزی گوفتارە ماقووڵە بەرجەستەکانە، کە ئەویش بریتییە لە پیتگەڵێکی ڕێکخراو و دەنگانێکی پچڕپچڕ و پارچەپارچە)[٣]، تەنیا ئەوە نەبێت دەیانگوت: خودا ئەم پیت و دەنگانە جگە لە زاتی خۆیدا بەدیدەهێنێت، هەروەها گرۆی ڕافیزەی دوانزە ئیمامی هەمان بۆچوونیان هەبووە، ئەوە نەبێت لە برگەی (بەدیهێنراوە) دا بۆ وتەی پەروەردگار ناڵێن بە بیانووی ئەوەی نەبادا سیفەتێکی خوا جگە لە خوادا ئاوێتە ببێت،[٤] جا گرۆی زەیدییەکانیش بۆچوونیان هەمان چەشنی موعتەزیلەیە،[٥] هەرچی ئیبازییەکانیش هەیە هاوڕای ئەشعەییەکانن لەو بەشەی دێرەکەدا کە دەڵێت: وتەی خوایە و پەسنێکی زاتی پەروەردگارە، بەڵام ڕاجیاشن لەگەڵ ئەشعەریدا لەوەی کە بە قورئان ناڵێن وتەی خوا، جا هەرکەسێکیشیان دیدگای بەم شێوەیە نەبوو ئەوە هاوڕای موعتەزیلیەکانە.[٦]

تەنانەت گرۆی (یەکانەیی بوون = وحدة الوجود) ناڵێن کە هەموو بوون بریتییە لە وتەی خوا، بەڵکوو دەیانگوت هەموو وتەیەک بریتییە لە وتەی

---

(١) حاشية البيجوري على جوهرة التوحيد, حققه وعلق عليه: علي جمعة، دار السلام للطباعة والنشر والتوزيع, القاهرة, الطبعة الأولى: ١٤٢٢هـ-٢٠٠٢ م. (ص١٢٩).

(٢) انظر شرح العقيدة الطحاوية, شجاع الدين هبة الله بن أحمد الحنفي الماتريدي، تحقيق: جاد الله بسام صالح، دار النور المبين للنشر والتوزيع، عمان-الأردن، ٢٠١٤م، (ص٩٦).

(٣) خلق القران، من أجزاء المغني في أبواب التوحيد والعدل، القاضي عبدالجبار، قوم نصه: إبراهيم الأبياري، إشراف: طه حسين، لجنة التأليف والترجمة والنشر، القاهرة-مصر، (ص٣).

(٤) الخلاف، محمد بن الحسن الطوسي، مؤسسة النشر الإسلامي التابعة لجماعة المدرسين، قم-إيران، الطبعة الأولى: ١٤١٧ هـ (١١٩/٦).

(٥) الإصباح على المصابح في معرفة الملك الفتاح، إبراهيم بن محمد بن أحمد المؤيدي، تحقيق: عبدالرحمن بن حسين شايم، مؤسسة الإمام زيد بن علي الثقافية، صنعاء-الجمهورية اليمنية، الطبعة الأولى: ١٤٢٢هـ -٢٠٠٢ م، (ص١٠٣).

(٦) الحق الدامغ، أحمد بن حمد الخليلي، مسقط-سلطنة عمان، ١٤٠٩ هـ (ص٩٩-١٠٤).

خوا، دەی سەرباری ئەوەش بە بۆگەنترین بۆچوون دانراون، بەمەش جوان بۆمان ڕوون بوویەوە کە شەحروور تەنیا خەریکی درۆکردن بوو لەم بابەتەدا، چونکە هیچ موسڵمانێک لە موسڵمانان لە هەموو پێڕ و تاقمەکانیش باوەڕی وانەبوو کە هەرچی بوونە بریتییە لە وتەی خوا، لەم دانەپاڵەشدا شەحروور درۆ دەکات.

جا ئەم کابرایە قسە بە دڵی خۆی دادەتاشێت و پاشان دەیداتە پاڵ هەرکەسێک کە بیبەوێت دەڵێت: "بوون خودی وتەی خوایە، کە بەدیهێنراوە و هەرگیز (قدیم) نەبوو." با ئێستا تاوتوێ بکەین ئایا قورئان مەخلوقە یان (قدیم)ـە؟ لەڕابردوودا موعتەزیلە ئەم پرسیارەیان خستووەتە ڕوو؟ هەڵوێستیش لەمەڕ ئەم بابەتی «مەخلوقە یان قەدیمە» ڕەنگدانەوەی هزری و بیریاریی ترسناکی هەبووە لەسەر ژێرخانی وڵات و کۆمەڵگە و بابەتی ئازادی مرۆڤایەتی.

یەکەم: بێگومان موعتەزیلە بۆچوونیان وابوو کە قورئان مەخلوقە، پێموایە ئەوان مەبەستیان لە قورئان ئەو مانایەیە کە لەم پەرتووکەدا باسمکردووە، کە مەبەستیان هەموو پەرتووکی قورئان نییە، بەڵکوو مەبەستیان لێکچووەکان (متشابهات) و مەبەستیان ئایەتە چەسپاوەکان (محکمات) نییە، لەبەر ئەوەی قورئان کراوە بە عەرەبی، بە عەرەبیش دابەزێنراوە، بەڵام بێگومان (أم الکتاب) بە عەرەبی دابەزێنراوە نەکراوە بە عەرەبی.[1]

تۆ سەیری ئەو وتە تێکەڵوپێکەڵانەی بکە! کە وتەیەک دەداتە پاڵ موعتەزیلە، تەنیا خۆی پێی وایە ئەوان وایان مەبەست بووە، خۆ دەکرا بگەڕایەتەوە بۆ سەرچاوەکانیان، بۆئەوەی بزانێت بۆچوونیان چۆنە پێش ئەوەی تێوەبگلێت و باوەڕی خۆی بداتە پاڵیان، چونکە ئەو قسەیەی دەداتە پاڵیان درۆیەکی ڕوون و ڕەهایە لە بابەتی وردەکاریی بەدیهێنراوەکان، لە باسی قورئاندا دەڵێت: "هەموو ئایەتە لێکچووەکان (متشابهات) و قورئان لای موعتەزیلە (دەچێتە

---

(١) الکتاب والقرآن، (ص٢٥٧، ٢٥٨).

ژێر ناوی موحکەم و موتەشابیهەوە) وەکوو باقی موسڵمانان، ئەوانیش وەکوو هەموو خەڵکی دەڵێن ئەوەی لە دوتوێی بەرگەکەدایە بریتییە لە قورئان وتەی خوایە، ئەو قسەیەشی کە دەڵێت: "وتەی خوا تەنیا بریتییە لە بوون" ئەوە پێشتر باسمان لەسەر کرد کە پێچەوانەی هەموو گرۆکانی موسڵمانانە.

پێشتریش باسمان کرد کە مرۆڤ بەشێکە لە بوون کە شەحروور دەڵێت بریتییە لە وتەی خوا، لەگەڵ ئەوەشدا ڕاجیاوازن، بەڵکوو کوشتاریش دەکەن، بانگەشەی ئەوەشی دەکرد کە ئازادی بریتییە لە وتەی خوا کە ئەگەر وابێت دەبوو ئازادی کارا و بەرپا بووایە، ئەگەر قسەی شەحروور بووایە ئەی بۆچی خەڵک یەک ڕێگا و دینی نییە؟

ئەمەش لە بابەتی بۆچوونی شەحروور لە بابەتی تواناکانی خوای گەورە ڕوون دەبێتەوە بۆمان، با پێکەوە بچینە سەر ئەو بابەتەش.

# هەڵوێستی شەحروور لەبارەی توانای خوای گەورە

شەحروور دەڵێت: "هەموو جووڵە و وەستانێک پێکەوە و بەشێوەیەکی گونجاو بە ویستی خوا دەبێت، بەڵام جووڵەی زەید یان وەستانی عەمر لەو باسەدا نییە، چونکە کە عەمر دەجووڵێت و زەید دەوەستێت بژاردەی عەمر خۆیەتی کە دەجووڵێت، زەیدیش دەوەستێ بە ویستی بە بژاردەی خۆی، بۆیەش پاداشت و سزای لەسەر وەردەگرن،[1] جا ئەمەش دژەواتایە لەگەڵ وتەی پێشووتری خۆی کە دەیگوت هەموو بوون بریتییە لە وتەی خوا، وتەی خواش دێتە دی بەبێ هیچ ڕێگرێک، کەچی لێرەشدا جموجووڵ و وەستانی مرۆڤانێک ڕوودەدات لە دەرەوەی ویست و توانای خوا، بەڵکوو ویستی خوا لە شیاوێتیدا ڕوودەدەن، لەوێشدا ویستی مرۆڤێک دێت کە بڕیاری ڕوودان یان ڕوونەدانی بدات، کە ئەمەش پێچەوانەی ئەو بنەمایەیە کە لەسەر قەدەر هەیە (خوا هەرچی ویستی هەبێت ڕودەدات، ئەوەشی نەیەوێ هەرگیز ڕوونادات.)[2]

جا شەحروور بۆ ڕوونکردنەوەی بۆچوونەکەی دەڵێت: "ئاخۆ خوا پێشتر بڕیاری داوەکە هیتلەر حوکمی ئەڵمانیا بکات و ببێتە هۆی کۆستی ڕووداوەکانی جەنگی جیهانی دووەم؟ یان ئاخۆ دەسەڵات و ستەمی زاڵمان و تاغوتەکان بەشێکە لە قەزا و قەدەری خوا؟. وەڵام: نەخێر، چونکە ئەمانە ملکەچی گوتەی (کن فیکون = ببە، ئیدی دەبێت) نابن."[3]

---

(١) الدين والسلطة، (ص٢٩٤).

(٢) العقيدة الواسطية، أحمد ابن تيمية، تحقيق: أشرف بن عبدالمقصود أبو محمد، أضواء السلف، الرياض، الطبعة الثانية، ١٩٩٩م، (ص١٠٧).

(٣) الدولة والمجتمع، (ص٢٠).

ئەم کابرایە نازانێت ئەمەی هێناویەتی دەبێتە بەڵگە لەسەر خۆی، چونکە کە جەنگی جیهانی ڕوویداوە ئاخۆ ئەگەر خوای گەورە کردارەکەی لۆ خەڵق نەکردبان ڕوویان دەدا؟ ئاخۆ ئەو ڕووداوانە و کوشتار و شەڕ و لێدانی سەر ژاپۆن بە بۆمبی ناوەکی بەبێ ئەوەی خودا ڕووداوەکان و کردارەکان بەدیبهێنێت ڕوویان دەدا؟ ئەگەر خودا ڕێگەی نەدابێت ڕوویدات ئەی کێ ئەو مۆڵەتەی بەدیهێناوە کە لە موڵک و خەڵقی خوادا ڕوویدات؟ ئەگەر باوەڕی وەها بێت کە جگە لە خوا ڕێگەی بەم ڕووداوانە دابێت بەڕاستی داندەنێ بە بوونی دوو خوادا، ئەگەریش باوەڕی وایە کە خوا هیچ ڕۆڵێکی بڕیاردانی ڕووداوەکانی نییە لەسەر ئەو جەنگە، ئاخۆ شەحروور پێیوایە ئەمانە خودایان ڕاچڵەکاندووە و لەپڕ ڕوویانداوە؟ ئاخۆ ئەگەر خوای گەورە ویستی هەبا ڕێگری بکات لەو ڕووداوانە هیچ کەس و شتێك دەتوانێت ڕێگریێت لەخوا یان هەر پێی وایە خوای گەورە ناتوانێت ڕێگری لە بەندەکانی بکات؟ جا ئەم کابرایە بە بانگەشەی خۆی دەڵێت تەنیا بەڵگە بە قورئان دەهێنێتەوە ئەم ئایەتەی بیرچووە:

﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾[1] واتە: «هیچ ڕووداوێک تووشی هیچ کەسێک نابێت بەبێ ویست و ڕێگەدانی خوا، جا هەرکەسێک باوەڕ بەخوا بهێنێت ڕێگەی ڕاستی پیشان دەدات، خوا بە هەموو شتێک زانایە.

جا شەحروور دەڵێت: "ڕووداوەکان و نارەحەتییەکانی ستەمکار و جەنگەکان بە ویستی خۆیان بووە نەک ڕێگەدان و ویستی خوا." دەی لەم ئایەتەی سەرەوەدا خوای گەورە دەفەرمووێت: «هەموو ئەوانە ڕوونادەن هەتاوەکوو خوا ڕێگە بە ڕوودانیان نەدات و هەمووی لە پەرتووکی قەدەردا نووسراوە پێش ئەوەی ڕووبدەن.» کەچی شەحروور بەم حاڵەیەوە دەیەوێت چاکسازی لە باوەڕی

---

(١) سورة [التغابن: ١١].

موسڵمانان بکات لە بواری باوەڕبوونیان بە قەزا و قەدەر. لەم وتەیەدا: (خوا هیچ کات خۆشبەختی و بەدبەختی، هەژاری و زەنگینی، تەمەن درێژی و کورتییەکەی لەسەر هیچ کەسێک نەنووسیوە.)[1]

کەچی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾[2]. واتە: «کلیلەکانی نهێنی پەنهانەکان تەنیا لای خوایە و هیچ کەسی تر نایزانێت، دەزانێت چی لە وشکانی و دەریاکاندا هەیە و هیچ گەڵایەک لە درەختێک هەڵناوەرێت بەبێ زانستی خوا، هیچ تۆوێک لە تاریکییەکانی ژێر زەوی لە وشک یان تەڕەزەوی ناتروکێت بۆ چرۆ ئیللا هەمووی لە پەرتووکی قەدەردا نووسراوە.»

کەچی شەحروور دەڵێت: "هیچ شتێک لە ستەم و چەرمەسەرییەکانی ژیان هەرگیز نەنووسراوەتەوە لە قەدەردا، هەرکەسیش دەمانچەوسێنێتەوە و ستەممان لێ دەکات ئەوە کار و بڕیاری خۆیەتی، بێگومان ستەم و دادپەروەری هاوتای بەرانبەری یەکترین لە زانستی خوای گەورەدا."[3]

ئەمەش لێ تێکەڵ بوونێکە کە شەحروور تێیکەوتووە، کە پێیوایە قەزا و قەدەر پێویستە خوا پێیخۆشبێت و ویستی لەسەر بێت ئەوجا ڕوویدات، ئەم بۆچوونەش پێشتر خەڵکانێکی زۆر بانگەشەیان بۆ کردووە، ئیمامی ئیبن قەیم (بەڕەحمەت بێت) لەم بارەوە دەفەرموێت:

"هەموو ئەم سەرلێشوان و ناحاڵیبوونە دەگەڕێتەوە بۆئەوەی لەنێوان خۆشەویستی خوا و ڕازیبوونیدا تێکەڵ دەکەن، لەگەڵ ویست و ڕێگەپێدانی

---

(١) الدولة والسلطة، (ص٢٩٤-٢٩٥).

(٢) سورة [الأنعام: ٥٩].

(٣) الدولة والسلطة، (ص٢٩٦).

خوا (قەدەری کەونی) تێکەڵ دەکەن، بنچینەی هەڵەکەش دەگەڕێتەوە بۆ هاوتاکردنی هەردوو بابەتەکە و گرێدانیان پێکەوە، جا گرۆی قەدەرییەکان و جەبرییەکان تێکەڵەی ئەمەیان کرد و بەهەڵەدا چوون، دەیانگوت: ویست و خۆشەویستی هەر یەکەیان هاوتایە."[1]

بەڵکوو وتەی ڕاست ئەوەیە لەم بابەتەدا: (جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان ویست و خۆشەویستی خوا بۆ شت و ڕووداوەکان، هەرگیز یەک و هاوتا نین، بەڵکوو جاری واهەیە خوای گەورە شتێک ڕێگەپێدەدات ڕوویدات و خۆشیشی ناوێت و شتی وەهای خۆشدەوێت کەچی ویستی ڕوودانیشی نافەرموێت.)

جا یەکەم: نموونەی ویستی پەروەرێن لە بوونی ئیبلیس و سەربازەکانی، هەروەها ویستی لە بوونی گشتی بۆ هەموو ئەوا(شت و کردار و گوفتارانە)ی لە گەردووندا هەیە سەرباری ئەوەی ڕقی لە هەندێکیان دەبێتەوە.

دووەم: (چەشنی خۆشویستنی ئیمانهێنانی کافرێک و گوێڕایەڵبوونی لاڕێیەک و دادپەروەربوونی ستەمکارێک و تۆبەکردنی تاوانبارێک، خۆ ئەگەر پەروەردگارمان ڕوودانی ئەمانەی بویستایە کە ڕوویدەن (بەناچارکردنی کەسەکانیان) ڕوویان دەدا، چونکە یاساکەی بەم شێوەیە کە خوا هەرچی بووێت کە ڕوویدات ئەوە دەبێت ڕوویدات و ئەوەیشی نەوێت هەرگیز ئەگەری ڕوودانی نییە.)[2]

(جا پەروەردگارمان فەرمانی کردووە بە بەندەکان کە گوێڕایەڵ و پەرستشکار بن، یاساغی کردوون کە بێگوێ و لاسار بن، هەرگیز ڕازی نابێ کە بەندەکانی کوفر بکەن، ئەوسا بەندەکانیش خۆیان بکەری کارەکانیانن

---

(١) مدارج السالكين، ابن قيم الجوزي، ناصر بن سليمان السعود، دار الصميمي للنشر والتوزيع، الرياض، ١٤٣٢ هـ-٢٠١١م، (ص٦٧٦).

(٢) مدارج السالكين، (ص١٩٢٨).

و پەروەرێن کردارەکانیانی بەدیهێناوە، هەروەها بەندەکانیش توانایان بەسەر ویست و کردارەکانیاندا هەیە، پەروەرێن خۆیان و کردار و ویست و تواناییانی بەدیهێناوە.)[1]

لەسەر ئەمەش ئیمامی ئەبوو ئیسحاقی ئیسفەراییینی تاوتوێی کرد لەگەڵ قازی عەبدولجەباری موعتەزیلی، جا عەبدولجەبار لە سەرەتای تاوتوێکردنەکەدا وتی: "پاکوبێگەردی بۆ ئەو زاتەی پاکیزەیە لە خراپەکاریی."

ئیمامیش فەرمووی: "پاکوبێگەردی بۆ ئەو زاتەی کە هیچ لە موڵک و مەلەکوتیدا ڕوونادات بە بێ ویستی خۆی."

عەبدولجەبار وتی: "ئایا پەروەردگارمان دەیەوێت خەڵکی بێگوێی بکەن؟!"

ئیمامیش فەرمووی: "ئاخۆ بە زۆرکاری و بێ ویستی ئەو خەڵکی لە گەردوونەکەیدا گوناهان دەکەن؟!"[2]

کەچی شەحروور خۆی بە تەنیا ناتوانێ لەگەڵ بۆچوونەکەی خۆیشیدا تەبا بێت، هەر خۆی دەڵێت: "هەموو جووڵەیەک و وەستانێک -پێکەوە بەشێوەیەکی ڕەها و هاوتا- بەویستی خوایە."[3] لەگەڵ ئەمەشدا هەر خۆی دەڵێ: "ئەگەر وتەکانم پێکابێتیان ئەوە لەلایەن خواوەیە و ئەگەر نەمپێکابێت ئەوە لە خۆمەوەیە."[4]

جا خۆ ئەگەر ئەو دووبارە جیاوازە هەردووکی وەکوو یەکن پێکان و نەپێکان هەردوو لە ویست و زانستی خوای گەورەن، ئیتر بۆچی یەکەم دەداتە پاڵ خوای

---

(١) العقيدة الواسطية، (ص١٠٨).

(٢) طبقات الشافعية الكبرى، تاج الدين السبكي، تحقيق محمود محمد الطناحي-عبدالفتاح الحلو، طبع فيصل عيسى البابي الحلبي، ١٣٨٣هـ-١٩٦٤م، (٤/٢٦١، ٢٦٢).

(٣) الدين و السلطة، (ص٢٩٤).

(٤) الدولة والمجتمع، (ص٣٧٥).

گەورە؟ ئەی چ مانایەک بۆ پێکان و سەرکەوتن دەمێنێتەوە کە بیداتە پاڵ خوای گەورە لە کاتێکدا هەر خۆی دەڵێ: "خوا هیچ کرداری بەدینەهێناوین و هیچ ویست و دەسەڵاتیشی بەسەردا نییە؟!"

ئەم کابرایە لەبەر ئەوەی کارگەی درۆیە -هیچ پێکنایەتەوە لەگەڵ بۆچوونە فەلسەفییەکاندا- چونکە لەولا دەیەوێت وەکوو نموونەی پاراو ڕەفتار بکات لەگەڵ ویستی مرۆڤدا، لەولاشەوە لایداوە بۆ شیکاریی و توانەوەی فەلسەفی بۆ ماددی، ئیتر بڕیاریدا کە مادده پێش هۆش دەکەوێت.[1] عەقڵیش بەرهەمی مێشکە، پێشکەوتنی عەقڵ بەندە بە پێشکەوتنی مێشکەوە.[2] لەسەر ئەم پێشەکییە گریمانی کردووە کە پێکبێتەوە لەگەڵ شیبوونەوەی ماددیدا بە دانانی ویستی مرۆڤ وەکوو پاشکۆی مادده، ئەمەش بۆئەوە نییە کە ڕەهابێت وەکوو شتێکی نموونەیی،[3] چونکە مادام دەگەڕێتەوە بۆ بنچینەیەکی ماددی بەدیهێنراو، کەواتە بەدیهێنراوە، خۆ ئەگەر وانەڵێت ئەوا لە دژەیەکدا دەگەوزێتەوە لەو پێچلێدانەیدا کە ماددەی هەڵبژاردووە بۆ بنچینەی عەقڵ، لەملاشەوە لە خەیاڵپڵاوی نموونەییدا نگرۆ دەبێت کە بانگەشەی نکۆڵیکردنی دەکات![4]

بێگومان زۆرێک لە کەڵە زانایانی سەلەف فەرموویانە: "بە زانست تاوتووێ بکەن لەگەڵ قەدەرییەکاندا، ئەگەر دانیان پێدانا ئەوە ملکەچیان بکەن، ئەگەریش نکۆڵییان کرد تەکفیریان بکەن."

مەبەست لە وتەی سەرەوە ئەوەیە کە ئەگەر کەسێک نکۆڵی زانستی

---

(١) الكتبا والقران، (ص٤٢).

(٢) القصص القراني، (١/٢٥٠).

(٣) وشەی (نموونەیی) لە زانستدا بۆ شتێکە کە تەواو بێت و هیچ شتێکی کاریگەر کاری تێنەکات. (گازی نموونەیی، مس یان زێڕی نموونەیی، شلگازی نموونەیی) زۆرن لە فیزیا و کیمیا و زانستە تاقیگەییەکانی تریشدا. (وەرگێڕ).

(٤) الكتاب والقران، (١/٢٥٠).

خوای گەورە بکات کە لە دێرین (قدیم)ـەوە زانیویەتی بە کرداری بەندەکانی. هەروەها پەروەردگار خەڵکی دابەش کردووە بۆ سەرفراز و چەرمەسەر. ئەمەشی نووسیوە لە پەڕاوێکی پارێزراودا و کەسێک نکۆڵی ئەمانە بکات قورئانی بەدرۆ داناوە، لەبەر ئەمەش دەکافرێنرێت، ئەگەریش دانیان نا بە زانستی خوداییدا بەڵام نکۆڵی بەدیهێنان و ویست و ئیرادەی خوایان کرد لە کرداری بەندەکانیدا لە ڕووی هێنانەدییانەوە، ئەو کاتە ملکەچیان دەکەیت، چونکە لەو بەشەیدا کە دانیان پێداناوە دەبێتە بەڵگە لەسەریان بۆ ئەو بەشەی کە نکۆڵی لێ دەکەن.[1]

ئیتر شەحروور دان بە چ لایەنێکی زانستی غەیبدا دەنێت بۆ خوای گەورە؟!

بەڵکوو تۆ بڵێی چ هەڵوێستێکی هەبێت لە بەرانبەر زانستی خوای گەورە لەسەر بوونەوەرانیدا؟

با لە بابەتی داهاتوودا ئەمەش بخوێنینەوە ...

---

(١) جامع العلوم والحكم، ابن رجب، تعليق وتحقيق: ماهر ياسين الفحل، دار ابن كثير، دمشق-بيروت، الطبعة الأولى: ١٤٢٩هـ-٢٠٠٨م، (ص٨١).

## هەڵوێستی لەبارەی زانستی خوای گەورەوە:

شەحروور دەڵێت: "زانستی خودا بریتییە لە زانستی بە هەموو ئەگەرەکانی پێش ڕوودانی ڕووداوەکان، بەڵام زانستی بە ورد و درشتی بژاردە و ئەگەرەکانی زەید و عەمر نییە لە بڕیار و کارەکانیاندا."[(١)]

قسەکەی شەحروور وەکوو و ئەوە دێتەوە کە کەسێک بڵێت من زانستی پەنهانەکان دەزانم، تۆ دەڵێی: نموونەیەکمان بدەرێ بزانین چۆن لە غەیب و پەنهانەکان دەزانیت؟ ئەویش بڵێت: سبەی تۆ یان دەمریت یان دەژیت، دوو بژاردەیە سێیەمت نایەتە ڕێ، شەحروریش بەم شێوازە وێنای زانستی خوای پەروەردگار دەکات، کە تەنیا ئەگەری ڕوودانەکان دەزانێت، بۆیەش دەڵێت: "زانستی خوا گشتییە بۆ شتەکان."[(٢)] واتا-ورد و درشتەکان نازانێت-.

شەحروور دەڵێت: "زانستی خوا باڵاترین زانستی ژمیریارە، باڵاترین زانستی ژمێریاریش بیرکارییە، هەر بۆیە زانستی خوا بۆ ڕووداوەکان بریتییە لە زانستێکی تۆمارکاری ئامارسازی ڕووت. بۆیە لە زانستی خوادا سێوێکی زەرد و دانەیەکی سوور بوونی نییە، بەڵام بوونی هەیە لە زانستی گشتیدا بەشێوازێکی پەیوەندیدار بە بیرکاریی ژمارەیی ڕووتەوە."[(٣)]

لەبارەی ئەو وتەی کە دەڵێت:

"زانستی خوا ناوازەترین زانستە و لەسەر شێوازی پەیوەندییە بیرکارییە

---

(١) القصص القراني، (١٦٠/١).

(٢) القصص القراني، (١٦٠/١).

(٣) القصص القراني، (١٦٠/١، ١٦١).

ژمارەییەکانە،" وەکوو بڵێی بەتەمایە نیگای بۆ تێگەیشتن لە پەروەردگار نزیک بکاتەوە بە بنەواکانی ئەندازیاریی کە پسپۆڕییەکەی خۆیەتی، ببۆئەوەی دواتر زۆر بە سانایی لەسەر خودا و پەسنەکانی خوا بدوێت، لەم ڕوانگەشەوە بۆچوونەکەی زۆر نزیکە لە بۆچوونی ماسۆنییەکانەوە کە دەڵێن: "خوا = ئەندازیارە گەورەکەی گەردوون."(١) تائەوەی لە قورئانەوە نزیک بێت، جا ئەوەی دەیەوێت بیڵێت ئەوەیە کە خوای پەروەردگار زانیاریی لە بابەتە ورد و درشتەکاندا نییە، بەڵکوو تەنیا زانستی بە گشتییەکان هەیە، ئەوەش لەسەر بنەماکانی شەحروور واتە خوای گەورە وردەکارییەکانی بەدی نەهێناوە لەڕاستیدا، ئاخر چۆن شتێک دروست دەکات کە نەیزانێت؟ ئەی چۆن دەکرێت ئەو شتانە لە موڵکی خودا هەبن لەکاتێکدا هیچ لەبارەیانەوە نەزانێت! ئەوانەش هەموو زۆر دوور و دژن لەگەڵ ئەوەی لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە کە دەفەرموێت: پەروەردگار هەموو شتێک دەزانێت. جا تەماشای وتەی شەحروور بکە: "هەرگیز ئەم وردەکارییە لە زانستی خوادا نییە کە کام سێوە زەرد و کامیان سوورە،" ئەمەشی بەراورد کردووە لەگەڵ فەرمایشتی خوا: ﴿يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ فَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴾(٢)، واتا: «ئەو ڕۆژەیە کە ڕووی هەندێک سپی و هەندێک ڕەش هەڵدەگەڕێت، جا ئەوانەی کە ڕوویان ڕەش دەبێت ئەوە بۆ بێباوەڕ بوون دوای باوەڕداریتان؟! سا لەو سزا بەئازارە بچێژن لەپای ئەو کوفرەی کردتان.» جا بە ڕایەکەی شەحروور بێت خوای گەورە نازانێت کێ ڕووی ڕەش یان سپی دەبێت.

بەڵام لەبارەی زانستی خوای گەورە بەڕوونی لە قورئاندا هاتووە: ﴿قَالُوا

---

(١) فک الشفيرة الماسونية، إيان جيتينز، ترجمة: غادة حرب، دار صفحات للنشر والتوزيع، دمشق-سورية، الإصدار الأول: ٢٠١٢م، (ص١٩٣).

(٢) سورة ال عمران (١٠٦).

ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا ۚ قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَاءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ النَّاظِرِينَ﴾[1]. واتا: «وتیان لە خواکەت بپرسە با بۆمان ڕوون بکاتەوە ڕەنگی مانگاکە چۆنە؟ فەرمووی: ئەو دەفەرموێت ڕەنگی مانگاکە زەردە، ڕەنگێکی سەنجڕاکێش و جوانی هەیە.»

بە وتەی شەحروور بێت خوا نەیدەزانی کە زەردە یان سوورە!

ئەم کابرایە سەرباری ئەوە دژایەتی هەموو بۆچوونێکی تەواوی زانایانی پێشینی میللەتی ئیسلامی کردووە هەر لە فیهقەوە بۆ ئوسوڵ و زمان، کەچی زۆر بێڕووانە بانگەشەی ئەوە دەکات کە تەفسیرەکانی ملکەچی زانستەکانی سەردەمە و دەڵێت: "تێگەیشتنمان بۆ قورئان ملکەچە بۆ زانیاری و زانستی ئێستامانە، لەبەر هەموو ئەمانەش باوەڕمان هێناوە و بەردەوام ئیمانمان بەم تەوژمەمان هەیە."[2] لەڕاستیدا لەم ڕوانگەوە شوێنی گوتارێک کەوتووە کە کە دەگەڕێتەوە بۆ پێش ئیسلام، بەڵکوو بۆ پێش سەردەمی نەفامیش دەگەڕێتەوە کە پەیامبەریان بۆ نێردراوە، چونکە ڕێک دەگەڕێتەوە بۆ تێڕوانینەکانی سەردەمی ئەرستۆ لەسەدەی چوارەمی پێش لەدایک بوونی مەسیح، دەبینین ئەرستۆ دەڵێت: "چەرخێنەری یەکەم -پەروەردگار[3]- هەموو بوون هەڵدەسوڕێنێ بەبێ ئەوەی خۆی بجووڵێت)[4]، بەڕای ئەو (خوا ئەزەلێکی بێ جووڵەیە، لەدەرەوەی هەستپێکراوەکانە.)[5] لەکاتێکدا جووڵەی نەرێکراو لای ئەو بریتییە

---

(١) سورة البقرة: (٦٩).

(٢) القصص القراني، (١٢٠/١).

(٣) أرسطوطاليس المعلم الأول, ماجد فخري، المطبعة الكاثوليكية، بيروت-لبنان, ١٩٨٥م، (ص١٠٠).

(٤) فصل في حرف اللام من كتاب (ما بعد الطبيعي) لأرسطوطاليس، مطبوع ضمن كتاب: أرسطو عند العرب, دراسة ونصوص غير منشورة، عبدالرحمن البدوي، وكالة المطبوعات، الكويت، الطبعة الثانية، ١٩٨٧م (ص٥).

(٥) سەرچاوەی پێشوو، (ص٤).

لە «گواستن، گۆڕان، کەموکورتبوون، زیادبوون»[1]

هەربۆیە ئەرستۆ نکۆڵی ئەوەشی کردووە کە ئەم -جۆلاوی گەورەیە (خوایە- هیچ شتێک بزانێت لە دەرەوەی خۆی، جا تەنیا زانستی بە خۆی هەیەو ئەمەش شکۆدارییەکەی بۆ خوا!)[2]

(لەسەر ئەم بنەمایەش بێت ئەستەمە بتوانین دان بە زانینی وردەکارییەکان بنێین بۆ خوا.)[3]

هەندێک لە فەیلەسووفەکانیش وەکوو ئیبن سینا هاوڕایی ئەرۆستۆیان کردووە لەم لایەنەیەدا، بە چەند دەربڕێن و ئاماژە و بیرخستنەوەیەک:

(هەبووی پێویست -واجب الوجود- پێویستە زانستەکەی بەوردەکارییەکان لەناو کاتدا نەبێت بۆئەوەی ڕابردوو و ئێستا و ئاینده لەبارەیەوە نەیەتە گۆڕێ، نەوەک گۆڕان بۆ پەسنەکانی زاتی موبارەکی بێتەکایەوە، بەڵکوو پێویستە زانستی خوا بە وردەکارییەکان لەڕوانگەی پیرۆزییدا بێت لەسەرەوەی کات و زەمانە و سەردەمەکاندا.)[4]

ئەو (دەیەوێت جیاوازی بکات لەنێوان ئەوەیدا کە زانینی وردەکارییەکان بەشێوەیەکی گشتی نەگۆڕدرێت، جیا لەوەی زانینی وردودرشت بەشێوەی

---

(١) كتاب النفس، أرسطوطاليس، نقله إلى العربي: أحمد فؤاد الأهواني، راجعه عن اليونانية: جورج قنواني، دار إحياء الكتب العربية مصطفى البابي الحلبي وشركاؤه، الطبعة الأولى: ١٩٤٩م، (ص١٨).

(٢) فصل في حرف اللام من كتاب (ما بعد الطبيعي) لأرسطوطاليس، مطبوع ضمن كتاب: أرسطو عند العرب، دراسة ونصوص غير منشورة، عبدالرحمن البدوي، وكالة المطبوعات، الكويت، الطبعة الثانية، ١٩٨٧م (ص٢٠).

(٣) أرسطوطاليس المعلم الأول، (ص١٠١).

(٤) الإشارات و التنبيهات، ابن سينا، مع شرح: نصير الدين الطوسي، تحقيق: سليمان دنيا، دار المعارف، القاهرة-مصر، الطبعة الثالثة، (٢٩٥/٣).

وردەکاریی دەگۆڕێت بە گۆڕانی بارەکە.)[١]

جا لەبەرئەوەی بۆچوونی یەکەمی هاوڕای ئەرستۆیە کە ناجوولێت بۆئەوەی هیچ گۆڕانێکی لێ ڕوونەدات، بۆیەش زانستی بە وردەکارییەکان نکۆڵی دەکرێت بەبیانووی نەگۆڕان، ئێستا تەنیازانست بە شێوەیەکی گشتی مایەوە، بەم شیوەیەش قسەکانی هەمان مانای بۆچوونەکەی ئەرستۆ دەگەیەنێت کە وتی:" لەبارەی زانستی خواوە تەنیا بەشێوەیەکی گشتی دەزانێت."[٢] یان زانستی هەیە بە وردەکارییەکان بەمەرجێک گۆڕانی بەسەردا نەیەت، کە ئەمەش واتا ئەو ڕووداوە وردەکارییەش ئەبێتە ئەزەلی!

بەهەرحاڵ، زانایانی پێشووی موسڵمانان وەڵامی ئەم قسە نابەجێیانەی ئیبن سینایان داوەتەوە، نەنگییەکانیان ئاشکرا کردووە، لێرە شوێنی زۆر ڕۆشتن نییە لەسەر بابەتە، ئەبینین کاتێک ئیمامی غەزالی وەڵامی ئەو وتانەی داوەتەوە، گومانەکانی لەبن دەرهێنان لەڕووی بیرارییەوە، جا دەڵێت: "ئەم وتانە لەگەڵ ئیسلامدا نایەتەوە بەهیچ شێوەیەک، باوەڕێکی لەم چەشنە بەدرۆدانانی هەموو پەیامبەرانە سەڵات و سەلامیان لەسەر بێت."[٣]

هەرچۆن لە کۆندا هەمان لێتێکەڵکردن ڕوویداوە لەلای گرۆی جەهمییەکان لەبارەی زانستی خوای گەورە بە شتە پەنهانییەکان، ئیمامی عوسمانی کوڕی سەعیدی داریمی دەڵێت:

"زانستی ڕەهای خوای گەورە لای ئەوان ئەوە نییە کە لە ئەزەلەوە بە ورد و درشتی شتەکان بزانێت، پاک و بێگەردی بۆ خوای گەورە لەو وەسفە

---

(١) شرح الطوسي على مصدر السابق: (٢٨٦/٣)

(٢) منطق أرسطو، تحقيق عبدالرحمن بدوي، وكالة المطبوعات -كويت، دار القلم بيروت-لبنان، الطبعة الأولى ١٩٨٠م، (٤١٨/٢).

(٣) تهافت الفلاسفة، أبو حامد الغزالي، دار المعارف بمصر، الطبعة الرابعة، (ص٣٠٧).

ناپەسەندەی ئەمانە، ئەوەی کە جەهمییەکان دەیڵێن ڕەدکردنەوەی قورئانی پیرۆزە، نکۆڵییە بۆ ئایەتەکانی خوای گەورە، خاوەنی مەزهەبێکی لەم چەشنە خاوەنەکەی بەرەو زەندەقە دەبات، هەتا دەگاتە ئەوەی باوەڕی بەڕۆژی دوای نەمێنێت، چونکە ئەوەی باوەڕی بە زانستی پێش وەختەی خوای گەورە نەبێت ملکەچە بەوەی باوەڕی بە لێپرسینەوە و زیندوبوونەوە و پاداشت و سزاکەشی نەبێت، چونکە هەموو بەندەکان پەیوەستن بەوەی باوەڕیان بە هەواڵەکانی خوا هەبێت کە دەفەرمووێت:«ڕۆژی پەسڵان دێت و گومانی تێدا نییە.»هەروەها خودا هەموو خەڵکانی نێو قەبر زیندوو دەکاتەوە، هەر خۆشی لێپێچینەوەیان دەکات لە ڕۆژی پەسڵاندا، پاداشت و سزاشیان هەر لای خۆیەتی.

جا ئەگەر خوا -بەپێی بانگەشەی ئەوان- هیچ شتیک نازانێت هەتاوەکوو ڕوونەدات، ئەی چۆن دەزانێت ئاکامی بۆچوونەکانیان دەگات بە کوێ لە ئایندەدا کە هێشتا قامی قیامەت نەهاتووە و زیندوبوونەوە ڕووینەداوە و هەموانیش دەزانین قیامەت و زیندوبوونەوە ڕوونادات تاوەکوو و تیاچوونی هەموو بوونەوەر ڕوونەدات و دنیا کۆتاییی نەیەت؟"[1]

جا ئەم کابرایە کە بانگەشەی ئەوە دەکات گوایە بیروبۆچوونەکانی سەردەمیانەیە! کەچی زۆر لە بۆچوونی خەڵکانی کۆنیشی نەپێکاوە، با بڵێین تازەکان و سەردەمییەکان، دەبینی ئەرستۆ تووشی چەندین ڕەخنەی توند بووەتەوە لەم دواییانەشدا، بەڵکوو دەوترێ دەرچوون لە قوتابخانەکانی و کۆتوبەندەکانی ئەرستۆ دەروازەی پێشکەوتن و مەعریفەیە، دەبینین «بیکون» پەڕتووکێکی تایبەت کردووە بە ناوی «ئەوراجانۆنە تازەکان» بۆ ڕەخنە و بەربەرچی ئەرستۆ، هێشتا لە «بیکون» کۆنترمان هەیە بۆ بەربەرچ دانەوەی ئەرستۆ کە هی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیەیە لە پەڕتووکی (الرد على المنطقيين).

---

(١) الرد على الجهمية، عثمان بن سعيد الدارمي، قدم له و خرج أحاديثه: بدر البدر, الدار السلفية, الكويت, الطبعة الأولى: ١٤٠٥هـ-١٩٨٥م, (ص١١١).

لەسەر بنەمای ئەوەی کە گوایە شەحروور خوازیاری هێنانی شتی تازەیە، شتێک بهێنێت کە تەنانەت ئەرستۆش نەیگوتبێت، تۆ بڵێی چی بکات؟ ئاخۆ پەیوەست دەبێت بە وتەی ئەرستۆ و دەڵێ خوا زانستی هیچ شتێکی نییە جگە لە زاتی خۆی؟ نەخێر، ئەی چی تازەی پێیە؟ شەحروور دەڵێت: "هەرگیز ناتوانین بڵێین خوا تەنانەت (ئاگای) لەخۆیشی هەیە،چونکە بەوشێوەیە ئاگای خوا لە زاتی خوا ڕاقی تر و بەبەهاتر دەبێت و توانایشی بەسەر زاتیدا زاڵ دەبێت."[١]

لێرەدا گەیشتۆتە سەرووی ئەرستۆ، ئەوەتا دەڵێت:"خوا تەنانەت زانستی بەخۆشی نییە." وشەی (ئاگایی) بەکارهێناوە لە بری زانین، کەچی دەربڕینی ئاگا لە قورئاندا نەهاتووە و وشەی زانست هاتووە بۆ ئەم بابەتانە، لێرەشدا شەحروور لە بنەماکانی خۆیشی لایداوە کە دەڵێت: "خۆمان پەیوەست دەکەین بەوەی تەنیا زاراوە قورئانییەکان بەکاربهێنین."[٢]

جا خوا لای شەحروور هیچ لەبارەی خۆشیەوە نازانێت، ئیتر چۆن زانستی بە جگە لەخۆی هەبێت، کەچی خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ سُبْحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِى بِحَقٍّ ۚ إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ ۚ تَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِى وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِكَ ۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ﴾[٣] واتە: «لەو ساتەی خوا دەپرسێ لە عیسای کوڕی مەریەم، ئایا تۆ بەو خەڵکەت وتووە کە خۆت و دایکت وەکوو دوو خوا جگە لە پەروەردگار بپەرستن؟ ئەویش دەفەرموێت: پاک و بێگەردی بۆ تۆ هەرگیز مافی ئەوەم نییە شتی وایان پێ بڵێم، خۆ ئەگەر وتبێتم دەیزانیت، لەبارەی من و نەفس و ناخی منەوە هەموو

---

(١) نحو أصول جديد للفقه الاسلامي، (ص٣٧).

(٢) الكتاب و القران، (ص٧٨).

(٣) سورة المائدة, (الآية ١١٦).

شتێک دەزانیت، من هیچ لەبارەی پەنهانەکانی تۆ نازانم، بێگومانم لەوەی تۆ ئەی پەروەردگارا زاناترینیت بە هەموو جیهانە پەنهانەکان.»

دەی (الله) لای شەحروور لەبارەی خۆیەوە هیچ نازانێت، بەڵکوو تەنیا زانستی گشتی هەیە لەشێوەی ژمێریاری و بیرکارییەکەی شەحروور، ئیتر چۆن لەبارەی بەندەکانییەوە شت بزانێت؟ ئەی شەحروور چی بە مانای ئایەتەکەی سەرەوە دەکات، چی بە وتەی پەیامبەر عیسا دەکات ئەگەر خوا لەبارەی خۆی و بەندەکانییەوە نەزانێت؟

جا ئەم ڕێڕەوە کە شەحروور گرتویەتی ڕزگاری ناکات لەو کێشەیەی ڕیشی گرتووە و ئەوەیشی پێشتر باسی کرد کە ئاوەزیی مرۆیی دەگەڕێنێتەوە بۆ بنچینەیەکی ماددی، بۆیە پێویستە لەسەری کە ویستی مرۆڤیش بداتە دەستی خۆی، بیشیگەڕێنێتەوە بۆ بنچینەیەکی ماددی ئەگەر ویستی ڕێکخستنێکی فەلسەفی بکات، لەوکاتەشدا ئەوەدەسەلمێت کە کردارەکانی مرۆڤ لەلایەن خوای پەروەردگارەوە دروستکراون، مادام دەگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەیەکی ماددی بەدیهێنراو، خۆ شەحروور ئەوەشی نکۆڵی کرد کە خوا شتی وەها بزانێت پێش ڕوودانیان، نەک لە ڕوانگەی ئەگەری ڕوودانەوە و زانینی گشتی، ئیتر حاڵی گەیشتە ئەوەی نکۆڵی زانستی خوای گەورە بکات تەنانەت بە زاتی موبارەکی خۆیشی، ئەی ئەم جارە چۆن لە تەنگژی هەتمیەتی ماددە خۆی دەرباز دەکات؟ کە هیچ دەرچەیەکی نییە، کەواتە مانایەکی تریش بۆ باوەڕی خۆی زیاددەکات کە ئاوێتەبوونی خوایە لەگەڵ بەدیهێنراوەکانیدا (حلول).

با پێکەوە باسەکانی ئاوێتەبوونی خوای گەورە لە بەدیهێنراوەکاندا تەی بکەین لای شەحروور.. لە باسی دواتردا.

# هەڵوێستی شەحروور لەمەڕ ئاوێتەبوونی خوا لەگەڵ بەدیهێنراوەکانیدا (الحلول):

دەربڕینەکانی شەحروور زۆر زاراوە لەخۆ دەگرێت کە لە پەرتووکە فەلسەفییەکاندا هەن، بەڵام کە ورد دەبیتەوە قەبارەی چەواشەکارییەکانیت بۆت دەردەکەوێت و هیچ بڕگە و وشەیەکی زاراوەکانی لەگەڵ یەکتردا ڕێکنین و لەگەڵ دەربڕینە فەلسەفییەکانیشدا نایەتەوە، هیچ شتێکی تازە و تازەگەریشی لێ هەڵناکرێت، مەگەر وەکوو ئەو پەندەی کە دەڵێت:"ئاوەکەی لێڵ دەکات بۆئەوەی وا دەربکەوێت کە قووڵە."، لەو میانەشدا بزانین چی دەڵێت لەسەر ئاوێتەبوونی خوا لە بەدیهێنراوەکانیدا (پەنا بە خوا):

دەڵێت: "الله تەنیا بوونە، واشدادەنێین کە گواستن و ڕاگواستنی لێوە سەرچاوە دەگرێت، نەک بەشێک بێت لەئەو، ئەمەش ئاوێتەبوونی وەحدەتولوجود هەڵدەوەشێنێت، جا لەکاتێکدا گواستن و ڕاگواستن بەبێ هەبوون ڕوونادەن، کەواتە نازانین و تێناگەین وناشتوانین هیچ شتێک لەبارەی خوا تێبگەین بەم ڕێگەیە نەبێت."[١]

لیرەدا بەشێوەیەک قسان دەکات کە هاومانای وتەکانی «هیگڵ» بێت بەڵام لە چەشنی چەسپاندنی بۆچوونی ئەرستۆ لەکاتێکدا هیگڵ دەیویست لە سنوورەکانی ئەرستۆ دەربچێت، بۆ ئەمیش دوای لابردنی وتە زیادەکان و گەڕەلاوژێکانی لە کۆتاییدا گەیشت بەوەی کە بڵێت:"ئەو جووڵاوەی کە ناجووڵێتەوە" کە هەمان وتەی ئەرستۆیە، بەهەرحاڵ ئەوەی لێرەدا دەمانەوێت

---

(١) نحو أصول جديدة للفقه الاسلامي (ص٣٨).

بیخەینە ڕوو بۆچوونی شەحروورە لەبارەی (وحدة الوجود)ەوە لەم چەند دێڕەدا نکۆڵی لێ دەکات، ئاخۆ ئەم نکۆڵییە بەردەوام دەبێت و ئایا ڕاست دەکات؟

شەحروور دەڵێت:

"ڕۆح: بریتییە لە ئەو عەقڵەی کە مرۆڤ بەهۆیەوە بیر لە شتەکان و ڕووداوەکان دەکاتەوە. ڕۆح نەمایندەی بوونی هەستیارێکی هۆشیاری مرۆڤایەتییە بۆ بەشەر،[1] مەعریفە و تەشریعیش دەرەنجامی ڕۆحە کە ڕاستەوخۆ لە خواوە هاتووە."[2]

ئاخۆ مەبەستی چی بێت لە بڕگەی (ڕاستەوخۆ لە خوداوە هاتووە)؟

خۆی ئەم دەربڕینە ڕاڤە دەکات و دەڵێت: "ڕۆح: بریتییە لە نەهێشتنی دژەواتاییو پەیوەندی نێوان (المجرد = داڕنراو)[3] و هۆکارەکانی مەعریفەت و شەریعەت و جێنشینییە، کە ڕاستەوخۆ لە خواوە هاتووە، چونکە لە سیفاتی خودایە."[4]

ئەمەش بەڕوونی واتا ڕۆحی مرۆڤ لە سیفەتەکانی خودایە، جا شەحروور بەردەوام دەبێت و دەڵێت:

"پێویستە لەسەرمان ئەوە لەبیر نەکەین کە مرۆڤ جێنشینی خودایە لەسەر زەویدا، لەبەر ئەمەش بەشێکی لە زاتی خوا تەنیا لە مرۆڤدا هەیە و لە باقی زیندەوەرانی تردا نییە، ئەویش ڕۆحە. مرۆڤ بووەتە جێنشینی خوا لەسەر زەویدا

---

(١) شەحروور جیاوازی دەکات لەنێوان (مرۆڤی بەشەر) و (مرۆڤی ئینسان) بۆیە ناچارین وشەکان وەکوو خۆی بهێنین بۆ ئەوەی مانا و مەبەستەکان بگاتە خوێنەری بەڕێز ... (وەرگێر).

(٢) تجفيف منابع الإرهاب، (ص٥٤).

(٣) المُجَرَّد: ما يُدْرك بالذِّهن دون الحواسّ. (لێرەدا بۆ مانای المجرد وشەی داڕنراو) بەکار هێنراوە، چونکە تەجرید واتە لە هەموو شتێکی تر پاڵفتە و داماڵراوە، یان لە بابەتە مادديیەکان خالیە، ئەو شتانەی مرۆڤ بەزەین و هۆشی پێی دەگات، وەکوو ئیمان و باوەر ...

(٤) الكتاب و القران، (ص٣٧٩)

و توانای بەدەست هێنانی زانیاریی هەیە، دەتوانێت مەعریفەت و تەشریعاتیش بکات."[١]

بەم قسەی شەحروور بێت مرۆڤ بەشێک لە زاتی خودای تێدایە، ئەمەش خودی مانای ئاوێتەبوونی خودای پەروەردگارە بە بەدیهێنراوەکانی (حلول)ـە کە گوایە شەحروور نکۆڵی لێ دەکرد! خۆ بەم تێڕوانینە بێت مرۆڤ بۆخۆی خوداوەندێکە، ئەمە ئەو کابرایەبوو کە دەیگوت: "دەنگی ئەقڵ پێویستە هەمیشە بڵندتر بێت بەسەر دەنگۆڵەکانی نەزانیندا."[٢] یدی لێرەدا چ مانایەک بۆ عەقڵ دەمێنێتەوە؟ کە باوەڕت وەها بێت بەشێک لە خوا لە مرۆڤدایە؟ ئاخۆ هیچ دەرچەیەکی هەیە بۆ قوتاربوون لە باوەڕی خاچپەرستان لە بەرجەستەکردنی خوا: (ئەم پەنهانیانەش هەرگیز عەقڵی مرۆیی توانای تێگەیشتنی نییە لێی!)[٣]

هەربۆیە شەحروور پێداگرە لەسەر ئەوەی کە (شتێکی هاوبەش لەنێوان خوا و مرۆڤدا هەیە، کە ڕۆحە)[٤]، بۆیە بەبێ شەرمکردن هاتووە دەڵێت: "الله -بەپێی تەنزیلی حەکیم- خۆی سەلماندووە بەهۆی پێ بەخشینی ڕۆح و خۆی نواندووە و پیشان داوە بەشێوەی مەجازی لە مرۆڤدا."[٥] سەیری ئەم کابرایە! وەها باسی پەروەردگار دەکات وەکوو بڵێیت مرۆڤێکی داڕماوە کە بەهۆی ڕاهێنانەکانی گەشەپێدانی مرۆییەوە گەیشتووەتە خۆ سەندنەوە و هەستانەوە، دواتر خۆی نواندووە و خۆی سەلماندووە، بەدواشیدا دەڵێت: بەپێی -تەنزیلی حەکیم- واتا قورئانی پیرۆز، ئەم کابرایە بەگریمانە باسی ئەو پەروەردگارە دەکات کە

---

(١) الكتاب و القران، (ص٣٩٠)

(٢) الإسلام و الإنسان، (ص١٣).

(٣) علم اللاهوت، بحسب معتقد الكنيسة القبطية الأرثدوكسية، ميخالى مينا، تقديم: يوساب الثانى، مطبعة الأمانة-مصر (٣٠٥/١).

(٤) الكتاب والقران، (ص٣٩٠)

(٥) القصص القرانى، (٢٩٢/١)

بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییەکان و هەموو پێکهاتەکانی نێوانیشیانە، کە دەفەرموویت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ﴾[١]. واتە: «ئەی خەڵکینە ئێوە هەژار و ئاتاجن بۆ بەخششەکانی خودای پەروەردگار، پەروەردگاریش دەوڵەمەند و بێنیاز و شایستەی سوپاسە.»

جا شەحروور بەوەشەوە نەوەستاوە بڵێت لە ڕووی مەجازییەوە، بەڵکوو گەیشتە ئەو ئاستەی بڵێت: "بەڵکوو خودی مرۆڤ بریتییە لە خوداوەندێکی بچووک بە مانا مەجازییەکەی."[٢]

ئاخۆ ئیتر چی مانایەک مایەوە بۆ مەجاز کاتێک مرۆڤت گەیاند بە ئاستی خودای پەروەردگار؟ هەر خۆی دەیگوت گوایە بەشێکی تایبەتی خوا لە مرۆڤدا هەیە، کە بریتییە لە ڕۆح کە پێکهاتەی نێوەندگیرە لەنێوان خوا و مرۆڤدا، ئەمەش بۆئەوەی لە بابەتی ماددەگەرایی دەربازی ببێت و ئازادی مرۆڤی بەندکردووە لەسەر بنەمای هاوبەشبوونی لەگەڵ خوای گەورە لە سیفەتێک لە سیفەتەکانیدا!

ئەم سیفەتە بەرپرسیاری هەموو تەشریعێکە، دواتریش هەرشتێک کە لەلایەن مرۆڤەوە تەشریع دەکرێت خودی تەشریعی ئیلاهییە! داخۆ مرۆڤ هاوبەش نین لەگەڵ خودادا! یان وەکوو شەحروور دەڵێت مرۆڤ بەشێکی بچووکە لە زاتی خوا! باشە ئیتر قسەکانی شەحروور چییان جیاوازە لە (بر و بیانووی گاورە زیندیقەکان، کە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد ئەو ڕۆحەی لە گیانی عیسادا بریتی بووە لە ڕۆحی زاتی خوا، هەربۆیە لەهەرساتێکدا خوا ویستبایی گوتارێک ئاراستەی مرۆڤ بکات لەسەر زاری یەکێک لە بەندەکانییەوە دەدوا، ئەوسا هەرچی فەرمانێکی کردبا دەیگوت و یاساغەکانیش هەر لەسەر

---

(١) سورة الفاطر، الاية (١٥).

(٢) القصص القرانی، (٢٩٢/١).

زاری بەندەکانییەوە دەگوت، ئەوەش بریتییە لەو ڕۆحەی کە لە توانای چاوی مرۆڤدا نییە بیبینێت)[١]، جا ئەمیش ڕۆح بەو مانایە دەچووێنێت کە هاوبەشە لەنێوان هەموو مرۆڤێکدا، نەوەک تەنیا تایبەت بێت بە عیسای کوڕی مەریەم یان کەسانی تایبەتی تر.

بەحسابی خۆی دەرچەیەکی فەلسەفی پەیدا کردووە بۆ حەتمییەتی[٢] ماددە تاکوو لەوێوە ئازادی ویستی مرۆڤ پەنکوێر بکات، بەڵام کەوتە تەنگەبەرییەکی ترەوە کە بریتییە لە ناچارێتی لە هەڵبژاردن (الجبرية)، چونکە ئەگەر بە قسەی شەحروور بێت مرۆڤ سیفەتگەلێکی خوایی تێدابێت – کە تایبەتن بە تەشریع – دەی ئەمە واتا هەقیقەتی مرۆڤەکان نییە یاسا و شەرعەکەی داناوە، بەڵکوو خوایە چونکە مرۆڤ لەم چەمکەی سیفاتدا وەکوو خوایە یان هاوبەشی خوایە، بۆیە دەتوانێت شەرع و یاسا دابنێتلەی ئەمە لەلایەکی ترەوە مانای وانییە کە هەر خوا شەرعەکەی داناو مرۆڤ ناچارێکی بێ بەهایە؟! هەرچۆن ڕۆح سیفەتی خوایە کەوابێت هەرچی لە مرۆڤەوە دەرچوو بریتین لە هی خوا، ئەمەش هەموو شەریعەتەکان ڕەها و ڕەوا دەکات (ئەگەر چی پڕبن لە ستەم و تەواو دژبەیەکیش بن لەگەڵ مافەکانی خەڵک) هێشتا هەر بریتین لە یاسای ئیلاهی، دەی توخوا کام باوەڕی جەبری لەمەی شەحروور جەبریی ترە؟ ئاخۆ ئیتر توانای هەڵبژاردنی مرۆڤ و بەرپرسیارێتی بژاردەکانی خۆی لەکوێدا دەبینیت؟ کاتێک بەهۆی سیفەتی خواییەوە بتوانێت یاسا و حوکمەکانی دابنێت؟

ئەم بۆچوونە ڕێک وتەی جەبرییەکانە: (نکۆڵی هەقیقەتی کردار لە بەندە

---

(١) الرد على الجهمية و الزنادقة فيما شكوا فيه من متشابه القران و تأولوه على غير تأويله، أحمد بن حبنل، تحقيق: صبري بن سلامة شاهين، دار الثبات للنشر و التوزيع، الطبعة الأولى: ١٤٢٤ هـ - ٢٠٠٣م، (ص٩٥).

(٢) سیفەتەلەوشەی (حتمية) وەرگیراوە،

و دانەپاڵی پەروەردگار)،[١] لەسەرووی هەمووشیانەوە پێشەوایان جەهمی کوڕی سەفوان: "هیچ کەس بەهیچ جۆرێک کردار و کاری خۆی نییە، هەمووی تەنیا هی (الله)یە"[٢] جا شەحروور بەوەوە نەوەستاوە کە کردارەکانی بەندە بداتە پاڵ پەروەردگار، بەڵکوو دەڵێ دەرهاویشتەیەکی خودی زاتی (الله)یە! چونکە ڕۆح لای ئەو سیفەتێکە لە سیفاتەکانی (الله)، جا ئەپرسین ئیتر ئەو ئازادییەی بۆ مرۆڤ باسی دەکەیەت لەکوێدایە؟!

خۆ ئەگەر ویستی مرۆڤ بە ڕۆحییەوە سۆنگەبگرێت کە سیفەتێکە لە سیفەتەکانی خوا (وەکوو شەحروور دەڵێ) دەی ئیتر مانای فەرمان و ڕێگرییەکانی پەروەردگار لەکوێدایە؟ ئاخر بە قسەی شەحروور بێت خوا فەرمانەکانی و نەهییەکانی ڕووی لە سیفەتێکی خۆی کردووە! یان بەشێک لە زاتی خۆی! جا ئەم قسانە چ جیاوازییەکی هەیە لەگەڵ قسەکانی حەللاجدا؟

## ألقاه في اليم مكتوفا وقال له إياك إياك أن تبتل بالماء

واتا: دەستی بەستەوە و فڕێیدایە نێو ڕووبارەکەی ئەوجا دەڵێت نەکەیت، نەکەیت، تەڕ ببیت بە ئاوەکەی.

ئەمە ئەو باوەڕەیە کە شەحروور هاتووە بیروباوەڕی موسڵمانانی پێ ڕاست بکاتەوە! کەوا بیر بکەنەوە سەلماندنی بوونی خودای گەورە بێ بەڵگەیە و ئیمان هیچ بەند نییە بە زانستەوە، سەرەنجام گومان بکەن لە بوونی خودای پەروەردگار. کەچی لەهەمان کاتدا وەها ببینن کە پەڕتووکەکانی جەنابی

---

(١) الملل و النحل، محمد بن عبدالكريم الشهرستاني, صححه: أحمد فهمي محمد، دار الكتب العلمية، بيروت-لبنان، الطبعة الثانية: ١٩٩٢م، ص(٧٢/١).

(٢) مقالات الإسلاميين، واختلاف المصلين، أبو الحسن الأشعري، تحقيق: محمد محي الدين عبدالحميد، المكتبة المصرية، صيدا-بيروت، ١٤١١هـ - ١٩٩٠م، (٣٣٨/١).

شەحروور تایبەتمەندن بە بنەما زانستییەکانییەوە!

یان باوەڕی خەڵک لاریکاتەوە بۆئەوەی کە (الله) هیچ لەبارەی وردەکاریی ڕووداوەکان نازانێت، غەیب نازانێت بەشێوەیەکی گشتی و ئەگەرەکان نەبێت، هیچ قەدەرێکی نییە و هیچ لە قەدەرەکان نەنووسیوەتەوە کە ڕوو دەدەن، لەپەنادا باوەڕیان وابێت کە مرۆڤ بەشێکە لە زاتی خوا و هاوبەشە لە سیفەتەکانیدا، خوا بە بەدیهێنانی مرۆڤ خودایەتی خۆی چەسپاندووە، هەموو بوون بریتییە لە وتەی خوا و بوونی مەوجوودە دەرەکییەکان بریتین لە بوونی ئیلاهی!

لێرەدا پێی دەوترێت: ئەی بۆ باوەڕ بەخوا بکەین لەکاتێکدا هیچ پێویستی بە بەڵگە نییە وەکوو بانگەشەی دەکەیت؟! ئەی شەحروور بۆچی نزا و پاڕانەوە دەکەیت لە خوا، لەکاتێکدا خۆت دەڵێیت خوا لە وردەکاری شتەکان نازانێت؟! مەگەر بە ئەگەر و مەگەر نەبێت؟!، ئەی چۆن دەڵێیت خوا بەدیهێنەرە بۆ شتانێک لە گەردووندا کە نایانزانێت و نەشیویستووە هەبن؟! لەهەمان کاتدا لە بەدیهێنراوەکاندا بەشێک لە زاتی خوا هەیە؟!

جا بیرتان بهێنمەوە ئەم کابرایە ئەوەیە کە دەیوت: "فوقەهاکانی ئیسلام خۆیان بە شەریکی خوا کردووە!"[١] بەڵام خۆی لەبیرکردووە! کە بەڕوونی دەڵێت مرۆڤ مەشێکی تەواوەتی زاتی خوایە و سیفەتێکی خوایە، لەهەمان کاتدا بانگەشەی ناڕاست دەکات بۆ موسڵمانان و دەڵێت: "سیستەمی توراس لە پەرتووکە فیقهیەکاندا پەیامبەریان کردووە بە هاوبەشی خوا لە پەرستراویدا."[٢] قسەکەی خۆی لەبیر بردووەتەوە کە دەڵێت: "لێرەدا شتێکی هاوبەش هەیە لەنێوان مرۆڤ و (الله)دا، کە بریتییە لە ڕۆح."[٣] ئەوەتا خۆی بانگەشەی

---

(١) الدين والسلطة: ص ١٨٧

(٢) كذا في المصدر.

(٣) الكتاب والقران، (ص ٣٩٠).

ئەوە دەکات کە پەروەردگار و مرۆڤ لە شتێکدا هاوبەش و شەریکن، کە ڕۆحە، بەڵکوو وتیشی بەشێکە لە زاتی خوا، کەواتە لای شەحروور مرۆڤەکان هاوبەشی خوان لە زات و سیفات و ڕۆحدا، بەو بیانووەش دەیوت کە مرۆڤ ئازادە چونکە هاوبەشی خوایە لە ڕۆحدا.! چاوی لەوانەی خۆی دادەخات و بەچاوێکی ترەوە سەیری جگە لەخۆی دەکات بۆئەوەی درۆیان بۆ هەڵبەستێت و بڵێت: "فوقەهاکان قسە بە ناوی خواوە دەکەن!"[١]

لێرەدا هیچ پێویست ناکات پەلبهاوین بۆ ڕوونکردنەوەی پووچەڵ و لەناوبەرەکانی باوەڕی ئیسلام بەورد و درشت، بۆئەوەی شەحروور نەڵێت ئەم قسانە من پەیوەست ناکات و لێکدانەوەی تایبەت یان خوێندنەوەی سەردەمیانەم هەیە بۆیان -بە بانگەشەی خۆی- بەڵکوو لەسەر ئەو بنەمایەی (هەرکەس خۆی دادوەری خۆی بێت ستەمی لێ ناکرێت) لەگەڵیدا دەڕۆین، ئەوەتا شەحروور لەژێر ناونیشانی «شیرکی جەستەگەرایی (التجسید)[٢] لێخۆشبوونی نییە.»:

(گەڕاینەوە بۆ تەنزیلی حەکیم -قورئان- بۆمان ڕوونبوویەوە کە لەبارەی جۆرێک لەجۆرەکانی شیریک دەدوێت، بە پێناسەیەکی زۆر ورد، ئەویش بریتییە لە شیرکی جەستەگەرایی، کە بریتییە لە پێدانی دوورییەکانی کات و شوێن و ماددەی سنووردار بۆ الله)[٣]

ئایا ئەمە ئەو قسەی خۆی ناگرێتەوە کە دەڵێت: "لەنێوان مرۆڤ و (الله) هاوبەشی زاتی و سیفەتی و ڕۆح هەیە)؟!

---

(١) القصص القرانی (١٥٥/١)

(٢) بەشێوەیەکی گشتی بەوانە دەوترێت کە_المجسمة)ن، هەندێک کاتیش ئەهلی هەوا و بیدعەبە (ئەهلی سوننەت دەڵێت المجسمة)!

(٣) أم الکتاب، ص (١٥٥).

دەی یان ئەوەیە کە ئەم کابرایە زەینی بەگەڕ دەخات بۆ شیکاری و دواتر سەری لە تێگەشتنێکی وەهاوە دەردەکات خۆیشی نازانێ چییە! هەربۆیە هەموو جارێک دەکەوێتە ئەم دژەیەکانەوە، لەم جێ پینە دەکەیت ئەوجێی تری هەڵدەوەشینیتەوە، یاخود ئەوەیە خۆی گیرۆدەی قووڵبوونەوەیەک کردووە کە باڵاترە لە پێداچوونەوە و پاشگەزبوونەوە، لەهەمان کاتدا هات وهاوار بەسەر خەڵکانی تردا دەکات گوایە لە دژەیەکیدان و بەناوی خواوە قسان دەکەن، زمان حاڵی شەحروور بەباڵای خۆیدا وا دەهۆنیتەوە کە:

**وَيَسْمُجُ من سواكَ الشيْءُ عندي فَتَفْعَلُه؛ فيحسُنُ منكَ ذاكَا!**

واتا: جگە لە تۆ هەرکێی تر بیکات لام ناشیرینە، ئەوەشی لە تۆوە دەرکەوێت هەرچی بێت هەر جوانە.

بەڕاستی ئەمەی شەحروور دەیکات پێی ناوترێت ئیجتهاد، چونکە ئیجتهاد لەنێوان پێکان و نەپێکاندایە، نەک لەنێوان کوفر و ئیمان، لەملا کوفر بکات و سەری بخات و بروبیانووی بۆ بهینێتەوە، ناویشی لێ بنێت بنەمای تازە و خوێندنەوەی سەردەمیانە، کەچی دەربکەوێت تەنیا کۆمەڵێک چەواشەکاری نەنگە و هیچی تر.

باشە ئەگەر حاڵ و باری ئەوها وێرانە بێت لە بابەتەکانی باوەڕ، ئاخۆ لە بوارەکانی تردا چۆن بێت؟ ئەگەر ئەمە قسە و بۆچوونی بێت لە بواری ئیمان بەخوا و سیفاتەکانی ئەی لە بوارەکانی تری وەکوو پایەکانی ئیمان چی بڵێت و چۆن بێت!

با پێکەوە گوزەرێک بەناوی غەیب و پەنهانەکاندا بکەین لەگەڵ شەحروور‌دا، بزانین لەمەدا چی دەڵێت.

## بنەما پەنهانەکان:

مەرج نییە خوێنەر هەمیشە متمانە بکات بە ناوی زل و زەبەلاح و ناونیشانی ڕازاوە کە لەلایەن زۆرێک لە نووسەرانەوە ڕەواجی پێ دەدرێت، بۆ نموونە بنەمای زمانزانی یان خوێندنەوەی سەردەمیانە و هاوشێوەکانی، چونکە هەندێک وەها تێگەیشتوون کە ئەمانە لقێکن لە بوارەکانی پسپۆڕیەتی لەو ماوەی کە پسپۆڕییە زانستییەکان بەربڵاو بوون، چونکە ئاراستەی زەین دەکات کە گومانی وابێت ئەمانە بنەما و پێبەندی تایبەتیان هەیە کە زانا بلیمەتەکان و ڕەخنەگرە بەتواناکان کۆکن لەگەڵیدا، لەگەڵ ئەمەشدا شۆکی نوێگەری تووش دەبێت و زاراوەی (خوێندنەوەی سەردەمیانە) کاریگەری لەسەر دەروونی خوێنەر دەکات و گەورە و باڵا دێتە پێش چاو، یان خەرمانەیەکی درەوشاوەی پسپۆڕییە ئەکادیمییەکان، کە وێناکە دەگاتە ئەو ئاستەی خەڵک وادەزانن لە پلەی پێداچوونەوە و خوێندنەوە بۆ قسەکانیان دەرچوونە و باڵاترن، چ بگات بەوەی بڵێیت با لێیان بپێچینەوە و ڕەخنەیان لێ بگرین!

بەڵکوو بابەتەکە لەوە دەرناچێت کە ئەو بانگەشەی (بنەمای زانستی، خوێندنەوەی سەردەمیانە، هتد) تەنیا پەردەیەکە بۆ شاردنەوە و خۆڵ لە چاوکردنی خەڵکی لەمەڕ ڕەخنە و داڕمانی بۆچوونەکانیان، ئەم فێڵەش بنەمای پەنهانی لە پشتەوەیە، چونکە لەکاتی گەڕانەوە بۆ زۆرێک لە سەرچاوە بەکارهاتووەکان لەلایەن نووسەرەکانەوە دەبینیت خودی نووسەرەکە پێوەی پەیوەست نەبووە، خۆ ئەگەر پەیوەست بێت بە بنەماکانیشەوە هیچ بەرهەمێکی نابێت، ئەوسا بۆت دەردەکەوێت ئەم ناونیشانە زلانە تەنیا ڕیکلامێکە و کۆکردنەوەی کۆمەڵێک بانگەشە و زانیارییە نەک کرۆکی بابەت و ڕاڤەکارییەکان، بۆیە ئاکامی

گاڵەگاڵ تەنیا خاوەنەکەی دەگرێتەوە، وە دادوەری ڕاستەقینە بەسەر نووسەرەکەوە ئەو بنەما پەنهانانەن کە بە ڕاشکاوانە نایانخاتە ڕوو و ناڵێت کە ئەوە ئامانجی ڕاستەقینەیەتی، لەکاتێکدا بە وردبوونەوە بۆت دەردەکەوێت ئەو بنەما پەنهانانە کاریگەرییەکی زۆر بەهێزیان لەسەر ڕەوشی نووسین و نووسەرەکە هەیە.

بێگومان لێرەشدا شەحروور باسی کۆمەڵێک بنەمای بۆ خۆی کردووە کە گوایە پەیڕەویان دەکات لە پەرتووکەکانیدا، بەتایبەتی (لایەنە زمانەوانییەکان)، بەڵام لە ڕاستیدا کۆمەڵێک بنەمای تری پەنهان زاڵن بەسەر پەرتووکەکانیدا، هەر ئەوانەشن پێوەری یەکەم بۆ یەکلایی کردنەوەی بۆچوون و ئاکامی دیدگاکانی، ئەڵبەتە ئەگەر بڵێین بنەما پەنهانەکان دوورن لە شێواندن و ناڕوونی هێشتا دەبینی لە سەرچاوە ڕەسەنەکەیەوە وەری نەگرتووە - ئەڵبەتە ئەگەر بزانێت سەرچاوەکەی کامەیە - چونکە بە ئاسانی ئەوە دەبینیت کە زۆرێک لە زانیارییەکانی لە پێگەی «ویکیپیدیاوە، و ئینسایکلۆپیدیا»وە هێناوە،[1] هەندێک جاریش لە زنجیرە بەرنامە و بابەتەکانی کەناڵی تەلەڤزیۆنی ناشناڵ جیوگرافیک هێناونی.[2]

هەربۆیە بڕیاردان لەسەر شەحروور ئەگەر بەپێی بنەما ئاشکراکانی خۆی بێت کە دەیڵێت، سەر دەکێشێت بۆئەوەی لێی تێ نەگەیت و نەتوانیت پێشبینی و وردبینییت هەبێت کە چی دەڵێت، ئەمەش بۆ نەنگیی ئەوە دەگەڕێتەوە شتێک دەڵێت نازانیت چۆن ڕاڤە و پێکەوە لکانی بۆ بکەیت لەگەڵ بابەتی پێش و پاشدا، ئەوش ڕاستییەکمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە شەحروور لە سنوورێکی دیاریکراوی بنەماداردا قسە ناکات، بەڵکوو تەنیا کۆمەڵێک هەڵبەست و چەواشەکارییە و بەپێی کۆمەڵێک بنەما دەتوانی لەیەکیان بدەیتەوە کە

---

(١) تەماشای کتێبی خۆی بکە: القصص القراني (٢٠٨/١، ٢٦٦)

(٢) سەرچاوەی پێشوو: (٢٤٣/١).

بەنزیکەیی لەگەڵ وڕێنەکانیدا بگونجێت، ئەوسا دوای ئاشکراکردنی بنەما پەنهانەکان و لێکدانەوەکان لەوانەیە خوێنەر بتوانێت دادوەریی بکات بەسەریدا لەم پەرتووک بۆ ئەو پەرتووک.

جا بەگشتی گفتوگۆکانی لەسەر بنەمایەکی شاراوە دەڕوات بۆ لارکردنەوەی مانای دەقێکی دیاریکراو، ئەڵبەتە ئەگەر پەڕتووکەکە لەگەڵ ناوەڕۆکەکەیدا بگونجێت و هەوڵ بدات کە دژیەکی لێ دەرنەکەوێت، کەچی هەم دیسانەوە لەبەردەم چەندین بنەمای ڕێزکارودا خۆی دەبینێتەوە کە تێیدا چاوی لە خەڵکی تر کردووە و داهێنانی خۆشی نییە، لێرەدا شەحروور هەوڵیداوە کە یاری بە ماناکانی زاراوەکان و دەقەکان بکات بۆئەوەی ماناکانی بەلارێدا ببات بۆ مەرامی خۆی، چونکە جگە لەم کەسانی تر دەزانن کە ئەم جۆرە دەربڕینانە نامۆن بە دەقەکان و خودی ئەمیش ئەوەی ئاشکرا کردووە کە بەتەواوی داماڵراوە لە توراس و لە سفرەوە دەستی بە ڕێگە تازەی سەردەمیانەکەی خۆی کردووە.

جا تێبینی ئەوە دەکەیت زۆرجار کۆمەڵێک وشەی هاومانا ڕیز دەکات بەسەر یەکدا لە قسەکانیدا، وەکوو (صیرورة و سیرورة)، یان دەربڕینی (منع الترادف) و (منع الحشو) و (السیاق) و ... هتد، کاتێک لەم دەربڕینانەی ورد دەبیتەوە بۆت دەردەکەوێت تەنیا وشە ڕیزکردنەوەیە و هیچی تر، تەنیا بۆ ئاواز و هۆرەیە تا وادەربکەوێت لە زەینی گوێگراندا کە کابرایەکی خوێندەوار و بەئاگایە، ئەگینا هیچ پەیوەندییان بە باس و کرۆکی بابەتەکەوە نییە، هیچ خزمەتێکی گەیشتن بە ئەنجامی باسەکە ناکات، بەڵکوو تەنیا کەوڵێکە بۆ شاردنەوەی بنەما پەنهانەکان کە بەسەر تەرزەکانییەوە زاڵە و ئامانجیش هەر ئەمەیە.

ئەو سیستەمە شاراوانەن کڕۆکی تەرزەکانی شەحروورن نەک قسە زەریق و بەریقەکان، ئەوەشی دەری دەخات لە زاراوە ڕێزکراوەکاندا کە تەنیا بۆ لێ تێکدانە، هەربۆیە سەرقاڵبوون بە زاراوە و وشە ڕیزکراوەکانییەوە سەرقاڵبوونتە بە ڕووکەشی باسەکان و دوورت دەخاتەوە لە کرۆکی بابەت و ئامانجەکە و سەرقاڵبوونتە بە پەراوێزەکان لەبری دەقەکان، ئەی باشە ئەم سیستەمە پەنهانانەی پشت شەحروور چین؟

با سەرێکیش لە داستانی سیستەمە شاراوەکانی پشت ئامانج و بەرهەمەکانی شەحروور بدەین، تا بزانین چی دەگوزەرێت، لە بابەتی دواتردا.

## داروینیزم، جەهمییزم و جگە لەوانەش:

شەحروور دەڵێت: "بەپێی خوێندنەوەی پێشوومان واپێویست دەکات کە تێگەیشتنمان لە دابەزێندراوی حەکیم – قورئان - تەنیا لەژێر ڕۆشنای زانست و زانیاری سەردەمەوە دەبێت."[١] جا لە ڕوانگەی ئەم بیر و باوەڕەوە پێش بەڵگەهێنانەوە دەڵێت: "مرۆڤ بە چەند قۆناغێکی جیاوازدا تێپەڕ بووە هەر لە مەیموونەوە کە لەسەر چوار پێ ڕۆیشتووە هەتاوەکوو گەیشتووە بە شێوەی مرۆڤی ئێستا."[٢] هەروەها لەسەر ئەم بنەمایەش قۆناغەکانی پێشکەوتنی مرۆڤ دابەش دەکات بۆ چەن جۆرێکی مرۆڤ. ئەوەتا ئەڵێ : لێرەدا مرۆڤی (بەشەر) هەن کە لەخۆڵی پێکهاتەکانی زەوییەوە دروست کراوە و مرۆڤی (ئادەمی) هەن لە خۆڵە و ژیر و تێگەیشتووە، کۆتا جۆریش مرۆڤی (ئینسان)ە کە هەر لە خۆڵ بەدیهێنراوە و عاقڵە و ئەرکی لەسەرشانە و زمان و بیرکردنەوە و پەیوەندیکردنی بە دەوروبەرەوە هەیە.[٣]

جا لەسەر ئەو بنەمایەش بێت: ئادەم پێش مرۆڤی (ئینسان) و دوای مرۆڤی (بەشەر) بووە.[٤] جا بە دیدگای شەحروور ئادەم کەسێکی مرۆڤ نییە، بەڵکوو تێڕوانینی خۆی بۆ ئادەم دەکات و دەڵێت:

"ئادەم بریتییە لە دەربڕینێک بۆ کۆمەڵێک بەشەر کە لەگەڵ کۆمەڵێکی

---

(١) القصص القرآني، (٢٤٢/١).

(٢) القصص القرآني، (٢٥٥/١).

(٣) القصص القرآني، (٢٥٧/١).

(٤) القصص القرآني، (٢٥٧/١).

تردا ژیاون و بە تێپەڕبوونی کات لەناوچوون."(١)

"ئادەم بریتییە لە قۆناغێکی نێوەند لەنیوان ئینسان و بەشەردا نەک مرۆڤێکی خاوەن کەسایەتیی تایبەت بووبێت.(٢)

هەر ئەمەش نهێنی ئەو قسەیەتی کە دەڵێت: "نوح (علیە سلام) یەکەم مرۆڤی جۆری (بەشەرە)کە وەحی بۆهاتبێت و یەکەمین پەیوەندی ئاسمان لەڕێگەی سروشتەوە بەشێوەی ڕاستەوخۆ بۆ مرۆڤ هاتبێت بریتییە لە پەیامهێن نوح (علیە سلام) و لە ئەویشەوە سەرەتای قسەکردنی مرۆڤ دەستی پێکردووە، هەروەکوو بیروباوەڕی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بووە، جا خاوەنی زمانێکی سادەبوون کە تەنیا بە کۆمەڵێک وشەی زۆر سادە دواون."(٣)

ئەو پێیوانییە کە ئادەم کەسێک بوو بێت، لەکاتێکدا خوای گەورە باسی ئادەم وەکوو مرۆڤ و کەسێک دەکات و پەروەردگار قسەی لەگەڵدا فەرمووە، کەوابێت پەیامبەریشە، بەمپێیەش شەحروور نکۆڵی لە پێغەمبەرایەتی ئادەم دەکات. خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ فَتَابَ عَلَيۡهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾(٤) واتا: «ئەوەبوو ئادەم موناجاتی پەروەردگاری کرد و داوای لێخۆشبوونی کرد.»

لێرەوە پرسیارەکەی (صادق جلال العظم )کە یەکێکە لە سەرخەرانی بیردۆزی داروین و ڕاستگۆیە لەگەڵ باوەڕەکەی خۆیدا، پرسیارەکەی ڕووبەڕووی هاوشێوەکانی شەحروور دەکاتەوە کە دەڵێت: "ئەگەر ئێمە سازشمان لەو بیروباوەڕەمان لەبارەی ئادەم و حەوا کرد لە بەرژەوەندی تێروانینیکی زانستیدا

---

(١) القصص القرآني، (٢٥٨/١).

(٢) القصص القرآني، (٢٥٨/١).

(٣) الكتاب والقرآن، (٦٧٧).

(٤) سورة [البقرة: ٣٧].

لەبارەی بنچینەی مرۆڤەوە، ئەی بۆچی سازش نەکەین لەو بیروباوەڕەمان دەربارەی بەهەشت و دۆزەخ؟ لەکاتێکدا باش دەزانین کە هەموو بیروباوەڕەکان بەشێکی جیانەکراوەیە لەو وتەیەی پەروەردگار کە دایبەزاندووە."[١]

شەحروور بەمەشەوە نەوەستاوە، بەڵکوو دەڵێت:

"بەدڵنیاییەوە مێژووی مرۆڤایەتی لە جیابوونەوەی شانشینی ئاژەڵەکانەوە دەستی پێکردووە، مێژووی پاڵاوتنی زمانەوانی بە گواستنەوە لە پەیوەندیی سروشتی لەنێوان دەنگ و واتاوە بۆ پەیوەندییەکی زاراوەیی، ئەوجا مرۆڤیش لەوەوپێش ناحاڵی بووە."[٢]

جا لەبەرئەوەی قۆناغی (مرۆڤی ئینسان) لەلای شەحروور دوای قۆناغی (مرۆڤی ئادەمی) دەستی پێکردووە. هەربۆیە پەیامبەر ئادەم (علیه سلام) بەشێک بووە لەشانشینی ئاژەڵەکان و کاتێک دەڵێت:"نوح (علیه سلام) زمانێکی سادەی زانیوە لە سادەترین شێوازەکان!" کەواتە ئادەم (علیه سلام) لەو جۆرە مرۆڤانەبووە کە هیچ شتێک تێنەگەیشتووە، چونکە جۆری مرۆڤەکانی پێش نوح (علیه سلام) بووە و زمانێکی پاک و پاراوی نەبووە. ئەمەش دژە مانا و مەبەستە لەگەڵ وتەی خوای پەروەردگار: ﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾[٣]. واتا: «پەروەردگارا ئێمە ستەممان لە خۆما کرد، سا ئەگەر لێمان نەبووریت ئەوا لە مایەپووچان دەبین.» شەحروور ئەم پاراویی زمانەی کردووەتە خاڵی جیاوازی لەنیوان «مرۆڤی ئادەمی و مرۆڤی ئینسانی». گوایە مرۆڤی ئینسان ئەرکدارە (مکلف)ـە بەپێچەوانەی مرۆڤی ئادەمییەوە، ئەمەش دژ یەکە لەبەرانبەر وتەی خوای پەروەردگار

---

(١) نقد الفكر الديني، صادق جلال العظم، دار الطليعة للطباعة والنشر، بيروت - لبنان، الطبعة الثانية: ١٩٧٠م، (ص٣٢).

(٢) الإنسان والإيمان، (ص٣٥٢).

(٣) سورة [الأعراف: ٢٣].

که دەفەرموویت: ﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ۝١٢١ ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ﴾[1]. واتا: «ئادەم سەرپێچی پەروەردگاری کرد و سەرگەردان بوو، پاشان پەروەردگاری هەڵیبژارد و تۆبەی لێ وەرگرت و ڕێنمایی کرد.»

بۆیه هیچ ڕێگەیەک نییه بۆ فەرمان و ڕێگری لێکردن و ڕوودانی تاوان و تەوبەکردن، ئیلا مەگەر لەلایەن کەسێکەوە بێت که له گوتاری خوایی و گفتوگۆ تێدەگات و وەڵام دەداتەوە.

پاشان شەحروور دەست دەکات به ڕوونکردنەوەی تێڕوانینەکانی بۆ پێشکەوتنی ئایینەکان و دەڵێت:

"لەکاتێکدا که مرۆڤ بەرڕووداوەکانی دەوروبەریدا ڕوانی وەکوو هەورە بروسکه و هەورە تریشقه و باران و ئەستێرەکان و با و پەیوەستی کردنەوە به هەسته ناوەکییەکانی خۆی، وەکوو برسێتی و تێربوون و چێژبینین و ئازار و ترس. سەرەتای پەرستنی سروشت (جگه له الله پەرستی) دەرکەوتووە به بیانووی ئەوەی که خوایەتی دیاردەکانی سروشت زاڵه بەسەر هەستەکانی مرۆڤەوە بەبوون و نەبوون."[2]

پاشان بەردەوام دەبێت:

"پاشان لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵگه (مرۆڤه ئینسانی)یەکان پسپۆڕیی خواوەندەکانیش پێشکەوت، کۆمەڵه ناوێکی جیاوازیان بۆ دانرا، وەک ئەستێرە ... و، لەگەڵ پێشکەوتنی ئامرازەکانی بەرهەمهێناندا دیاریکردنی خواوەندەکان بەتەواوەتی دەستنیشان کران."[3]

---

(١) سورة [طه: ١٢١-١٢٢].

(٢) الإسلام والإيمان، (ص٣٥٢).

(٣) الإسلام والإيمان، (ص٣٥٣).

شەحروور پێی وایە کە باوەڕی هاوەڵ بڕیاردان یەکەم باوەڕبووە لە مرۆڤدا و یەکەمین دەرهاویشتەی تێگەیشتنی مرۆڤبووە. هەروەها یەکەمین توانای تێگەیشتنی بووە، بەڵام یەکخواپەرەستی بریتییە لەقۆناغێکی دواتر، دوای پێشکەوتنی هزری (مرۆڤە ئینسانەکان) هەربۆیە بەڕاشکاوانە دەڵێت: "ئیسلامێک کە تەوحیدی خوای لەخۆگرتبێت، سەرەتا لە سەردەمی نوح (علیه سلام) دەستی پێکردووە."[1] بەم پێیەش ئادەم (علیه سلام) کەسێکی یەکخواپەرست نەبووە، ئەمەش پێچەوانەی دەقی قورئانە دەفەرموێت: ئادەم (علیه سلام) داوای لێخۆشبوونی کردووە، پەروەردگار هەڵیبژاردووە و خۆی و خێزانەکەیشی لەسەر یەکخواپەرستی بوون، بەڵام شەحروور بابەتەکە بەتەواوەتی ئاوەژوو دەکاتەوە، هاوەڵ بڕیاردان (شیرک) دەکاتە بنچینەی باوەڕی مرۆڤ، بەپێچوانەی تەوحیدەوە کەبەلای ئەوەوە دواتر هاتووە، بەڵام لەپێشدا بۆچوونەکەی بەشێوازی گریمانەیی داناوە و بەئامانجی هەڵوەشانەوەی ئەوەی کە قورئان باسی کردووە تاکوو تێکەڵی بکات لەگەڵ بیرو بۆچوونەکانی خۆیدا بیهێنێتەوە.

ئەمەیشی کە شەحروور دەیڵێت تەنیا بریتییە لە تازەکردنەوەی ئەو بۆچوونەی کە داروین هەیبووە سەبارەت بەئایینەکان. ئەبینین داروین دەڵێت: "هەرلە سەرەتای دەستپێکردنی توانای تایبەت بە ئەندێشە و سەرسووڕمان و فزوڵی -سەرەڕای ئەو هەندە توانای کە هەیبووە بۆ بیرکردنەوە- کە بەشێوازێکی لاوەکی، ئەوکاتە مرۆڤ بە سروشتی خۆی پێویستی زۆری بەتێگەشتن هەبووە بۆ ئەو بارودۆخەی کە لە دەوروبەریدا دەگوزەرێت، سا لەبەر ئەوەش ئەرکی خۆیەتی خەملاندنێکی شاراوە بکات لەمەڕ باسی وجود و بوون."[2]

---

(١) الإسلام والإيمان، (ص٣٥٣).

(٢) نشأة الإنسان، تشارلز داروين، ترجمة وتقديم: مجدي محمود المليجي، المجلس الأعلى للثقافة، القاهرة، ٢٠٠٥م، (٢٤٩/١).

هەتاوەکوو ئەوەی کە دەڵێت: "هەمان ئەوتوانا بەهێزانەی کە مرۆڤی لەسەرەتاوە هەیبووە ئاراستەی کردووە بۆ باوەڕهێنان بە لایەنە ڕۆحییە شاراوەکان و پاشان پیرۆزکردنیی کوێرانە و پاشان بۆباوەڕبوون بەکۆمەڵێک پەرستراو، لەکۆتایشدا بۆ باوەڕهێنان بە پەرستراوێکی تاکوتەنیا -خۆ دەکرێت ئەوها ئاڕاستەی کردبێت مادام هیشتا توانای بیرکردنە و خەملاندنی لاوازە و سەرەتاییە- دەکرێت هەر ئەوەش ئاراستەی کردبێت بۆ خوارافات وکلتووری نامۆ و جیاواز."(١)

ئەوەتا داروین پێیوایە کەبیرکردنەوەی مرۆڤەکان بەباوەڕهێنان و بەکاراکتەرە ڕۆحییەکان دەستی پێکردووە و پەرەیسەندووە بۆ بیرۆکەی باوەڕهێنان بەچەند پەرستراوێکی جیاواز، پاشان باوەڕهێنان بەخوایەکی تاک و تەنیا، ئەمەش لەجۆری خوڕافات و کۆمەڵێک عاداتی نامۆ دادەنێت، هەربۆیە پێیوایەدەکرێت لەداهاتووشدا ئەم خوڕافاتانە دووبارە بکاتەوە.

هەرلێرەیشەوە گرفتێک بۆ هەندێ کەس دروست بووە لەسەر ئەم وتەیەی داروین! دەڵێن گوایە داروین دانی بە بوونی بەدیهێنەرێک (الخالق)دا ناوە لەپەڕتووکی (أصل الانواع)دا کاتێک دەڵێت: "لێرەدا بێگومان جوانی و بڵندییەک لەم ڕوانگەوە بۆ ژیان هەیە کە بەهۆی هێزە جیاوازەکانی بەدیهێنەرەوە کراوە بەبەری بوونەوەردا لە زۆربەی چەشنەکان، یان یەک شێوەی تایبەتدا."(٢)

ئەم گرفتە زۆر بە ئاسانی دەڕەوێتەوە پاش ئەوەی کە زانیمان پەڕتووکی (نشأة الإنسان) کە داروین لە پەڕتووکی (أصل الأنواع)دا ئاماژەی پێ دەدات هەر ئەو پەڕتووکەیە کە قسەکانی سەرەوەی لەبارەی قۆناغەکانی گۆڕانکاری پرۆسەی ئایین و پێشکەوتنەکانی باوەڕی تێداکردووە، کە پێیوابوو بەرهەمی

---

(١) نشأة الإنسان، (٢٥٢/١، ٢٥٣).

(٢) أصل الأنواع: نظرية النشوء والارتقاء، تشارلز داروين، ترجمة: إسماعيل مظهر، دار التنوير للطباعة والنشر والتوزيع، بيروت-لبنان، ٢٠٠٨م، (ص٥١٠).

زەینی مرۆڤە و لە بوارەکانی خورافات و عاداتی نامۆدا پۆلێنی کردووە، ئەم پەڕتووکەی (نشأة الإنسان)ی دوای دوانزە ١٢ ساڵ لە پەڕتووکی (أصل الأنواع)دا[١] نووسیوە، لەبەر ئەمەشە کە داروین لە ژیاننامەی خۆیدا دەڵێت: "باوەڕم بە بوونی (الله) هەبوو، تا ئەوەی بیرم بێت باوەڕێکی زۆر پتەویشم هەبوو لەو دەمەی پەڕتووکبی (نشأة الأنواع الحية) و (أصل الأنواع)م دەنووسییەوە، بەڵام جار لەدوای جار ئەو باوەڕەم زیاتر کز و لاواز دەبوو ئەگەر چی زۆر بەرزونزمی بەسەردا دەهات، بەڵام ئێستا گومان لە بوونی خوا زیاتر و قووڵترە لەناخمدا."[٢]. لەکۆتاییدا بەڕوونی دەڵێت ئیمان خوڕافەیەکی ڕەهایە.

هەندێ کەس دەڵێن: لەکۆتاییدا داروین بووە بە گرۆی (نازانم = لاأدری) ڕاستە باوەڕی بە بوونی خوا نەبووە،[٣] بەڵام ئەوە ناگەیەنێت کە نکۆڵی بە بوونی خوای کردبێت!

لەوەڵامیاندادەوترێت: گرۆی (نازانم = لاأدری) هاوباوەڕی دوو گرۆی ترن، ئەوانیش نکۆڵیکارانی بوونی خوای پەروەردگار لەوەدا کە باوەڕیان بە خوای پەروەردگار نییە و دانیش بەباوەڕبوونیدا نانێن، ئەگەر وانەبا خۆدی خۆی باوەڕی پێ دەهێنا. بەڵام داروین لەکۆتاییدا گەیشتووە بەوەی کە باوەڕ تەنیا بۆچوونێکە پاش چەند قۆناغێکی پێشکەوتن لە بۆچوونگەلێکی دیکەوە، لەو ڕوانگەیەوە کە ئاخۆ هیچ بەدیهێنەرێک بۆ ئەم بوونە هەیە یان نا؟ ئا لەمەدا داننانێت بە وەڵامەکەیدا، هەر بۆیە داروین تەنیا لەم ڕوانگەوە (نازانم = لا أدری)ـە.

بەگەڕانەوە بۆ لای وتەکانی شەحروور بۆمان دەردەکەوێت کە تێگەیشتنێکی

---

(١) مقدمة مجدي محمود المليجي لكتاب نشأة الإنسان، (٥٢/١).

(٢) قصة حياة تشارلز داروين، (ص٣١٦).

(٣) قصة حياة تشارلز داروين، (ص٣١٦).

تێکەڵ و ناڕێکی هەیە. لەملا بەزمانێکی داروینیزمانە لەبارەی پەرەسەندنەوە دەدوێت بەڵام بەخێرا دەیگۆڕێت و بە زمانی چەشنی مارکسیزمانە دەڵێت: "لەگەڵ پەرەسەندنی ئامرازەکانی بەرهەمهێناندا"، هەرچەندە کە باوەڕی مارکسیزم و داروینیزم دوو دیدگای جیاوازن، بەڵام ئەو هەردووکیان پێکەوەی گرێدەدات، ئەمەش دەرخەری ئەو ڕاستییەیە کە ئەم کابرایە کەسێکی دامەزراوی یەکلا نییە لەسەر وتە و ڕوانگەیەکی فەلسەفی دیاریکراو، بەڵکوو لێرەو لەوێ چەند بۆچوونێک کۆدەکاتەوە و دایدەڕێژێتەوە لە دێڕەکانیدا، وەکوو بڵێی زادەی بیر و هزری خۆی بن، بێگومان ئەو تەنیا کۆکەرەوەیەکە بەبێ تێڕامان، ئەمەش لەڕاستیدا هیچ پەیوەندی بە پەڕتووک نووسین و نووسەرییەوە نییە.

پەرەسەندنی ئایین لەلای شەحروور پاشکۆی پێشکەوتنی توانا هزرییەکانە بۆ باڵاوتنی بیرپارییە، هەربۆیە زۆر سەخت نییە بۆی کە پێیوابێت هەندێک لە پەرستشەکانی ئیسلام بریتییە لە پاشماوەی پەرەسەندنێکی کۆن لە بت و پەیکەر بەرستی دیاریکراوەوە، دەڵێت: "بت و پەیکەرە پەرستراوەکان بەلای ئێمەوە کۆمەڵێک دەستەواژەن بۆ پەرستنی کۆمەڵێک شتی دیاریکراو، ئەم دیاردانەش لە بۆچوونی مرۆڤەکاندا زاڵبوون هەتاوەکوو پێش باڵابوونی تێڕوانین بۆ ئاستی داڕنین (التجريد) و پاڵاوتن، کاتێکیش پەیام دابەزی بۆسەر دڵی پێغەمبەری عەرەبی (ﷺ) زۆرێک لەخەڵکی تاوەکوو ئەوکاتەش بۆچوونێکی بەرجەستەییانەیان لەناخدابوو، باوەڕیان تەنیا بەو شتانە هەبوو کە دەبینرێن و دەبیسترێت و دەستی لێدەدرێت. لەبەرئەوەش بوو کە ئیسلام کۆمەڵێک لەدروشمە بەرجەستە دیاریکراوەکانی بە دروست دانا وەک تەواف و ماچکردنی بەردەڕەشەکە و ڕەمی جەمەرات و حەج وعومرە."[(١)]

جا بەپێی بانگەشەکانی شەحروور بێت، حەج و عەمرە بریتییە لە پەرستشی

---

(١) القصص القرآني، (١٥٧/٢، ١٥٨).

بەرجەستەی پاشماوە لەپاشماوەکانی پەرەسەندنی کۆنی ئایین، ئەگینا مرۆڤ بەگەیشتن بە قۆناغی پاڵاوتن و دارِنین ئەوەیان تێپەڕاندووە و ئیسلام بۆیە هێشتوویەتیوە -بەقسەی شەحروور- تەنیا لەبەر ڕەچاوکردنێک بۆ زۆرێک لەخەڵکی کە هێشتا نەگەیشتوون بە ئاستی پاڵاوتنی باوەڕیان، جا ئەم کابرایە هەندێک لە دروشمەکانی ئیسلام بەبت پەرەستی دادەنێت، لەکاتێکدا باش دەزانێت کە موسوڵمانان نە کەعبە و نە بەردەڕەشەکەش ناپەرەستن، کەچی شەحروور بەزۆر بە بت پەرەستی و پەیکەر پەستییەوە دەیانلکێنێت.

هەر لەڕوانگەی زیادەڕەویکردنی لەزانستەکانی ئەندازیاری و بیرکارییەوە پێیوایە کە ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە مرۆڤەکان لە قۆناغی دیاریکردنەوە بگوازێتەوە بۆقۆناغی پاڵاوتنی باوەڕ. جا دەڵێت: "پەیامی موحەممەدیی دەستی مرۆڤی گرت لەقۆناغی دیاریکردنەوە بگوازێتەوە بۆقۆناغی پاڵاوتنی باوەڕ، لەپەرستنی شتەکانەوە بۆ پەرستنی خوایەکی تاک و تەنیا."(١)

لێرەدا دەوترێت: ئەم (پاڵاوتنی باوەڕ = التجريد)ە بریتییە لەپرۆسەیەکی هزری کە هیچ پەیوەندی بە دەرەوەی هزرەوە نییە، بەڵکوو ئەوشتانەی لەدەرەوەی هزری مرۆڤدان پێیان دەوترێت بەرجەستەکان، هەریەکێکیان سیفاتی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام هزری مرۆڤەکان کۆمەڵێک لەسیفەتەکان دەسڕێتەوە و کۆمەڵێکیش لەجێگەی خۆی دەهێڵێتەوە، بۆ نموونە مرۆڤ بە کۆی زانیارییەکانی لەبارەی گرۆی ئەسپەکانەوە دەگاتە پاڵاوتنی تێگەیشتن بۆ بوون و مانای ئەسپ، لێرەدا بوارێک نامێنێتەوە بۆ تاوتوێی ڕەنگ و قەبارە و لایەنەکانی تری ئەم بوونەوەرە، بەڵکوو لە ڕوانگەی ترەوە لەژێر ناونیشانی تایبەتمەندیدا سیفاتی تری جێ دەکاتەوە نموونەی شێوازی حیلکە و دەنگی، بەڵام ئەسپ لەڕاستیدا هەرگیز داناماڵرێت لە ڕەنگ و شێوە و هتد، بەڵکوو

---

(١) القصص القرآني، (١٥٨/٢).

هیچ ئەسپێک نابینیت بەبێ تایبەتمەندی خۆی، ئەگەر چی زەین و عەقڵ لەهەموو سیفەتەکان داماڵرابێت، بۆیە واقع هیچ شوێنی لایەنە هزریی و زەینییەکە ناکەوێت، بەڵکوو بەپێچەوانەوە زانیارییەکان شوێنکەوتەی واقیعی بەرجەستەن.

جا شەحروور خۆی ئەم بۆچوونە هەڵدەبژێرێت ودەڵێت: "ناسینی ڕاستەقینە جیاوەزە لەگوماناوی و بریتی نیە لە تەنیا کۆمەڵێک وێنای هزری ڕووت، بەڵکوو لەبەرانبەردا کۆمەڵێک شتی واقعی هاوشێوەیەتی، چونکە بوونی شتەکان لەدەرەوەی هزردا بریتییە لەهەقیقەتی بوونیان."[1]

بنەما لەسەر ئەمەش داڕنین نابێتە هەقیقەت بۆ شتەکان لەدەرەوەی هزر، بەڵکوو تەنیا وێنەدانەوەیەکە بۆ هەمان بوون لەواقیعدا، هەربۆیە داڕنینە زەینییەکان تەنیا بریتین لە شتی گریمانەیی لە هزری مرۆڤدا، هیچ شتێکیان لەواقیعدا بوونیان نییە.[2]

ئیبن تەیمییە دەفەرمووێت: "قوتابخانەی پەریپاتێتیزم[3] ماهییەتە هزرییەکان دەیچەسپێنن وەکوو لایەنی عەقڵ، هەروەکوو بوونی پەتییش دەچەسپێنن وەکوو

---

(١) الكتاب والقران، (ص٤٢).

(٢) الرد على المنطقيين، أحمد ابن تيمية، دار ترجمان السنة، لاهور-باكستان ١٢٩٧ هـ ١٩٦٧م، (ص١٣٩).

(٣) ناوەکەبەعەرەبی (المشاؤون)بوو: قوتابخانەیەکی فەلسەفییە لە یۆنانی کۆنە، بیرۆکەکانیان لە دامەزرێنەری ئەو قوتابخانەیە وەرگرتووە، فەیلەسوفی یۆنانی ئەرستۆ، کە خوێندکارەکانی ناویان لێنابوو پەریپاتیتیک. ناوی قوتابخانەکە لە وشەی peripatos وەرگرتووە کە بە واتای پلەکانی هۆڵەکانی وەرزشی ئەسینای ئیمپراتۆرێتی یۆنانی دێت، کە پێشتر ئەندامانی ئەو قوتابخانەیە لەوێ کۆدەبوونەوە. وشەیەکی تری هاوشێوەی یۆنانی هەیە بە ناوی peripatetikos بۆ کرداری ڕۆیشتن و سیفەتی peripatetic کە بە واتای "ڕۆیشتن" دێت. دوای مردنی ئەرستۆ ئەفسانەیەک سەریهەڵدا کە ئەو وانەبێژێکی "پێریپاتێتیک" بووە، بۆیە ناوی "پێریپاتیکۆس" جێگەی وشەی ڕەسەنی "پێریپاتۆس"ی گرتەوە. (ویکی پیدیا). (وەرگێر).

مادده و کات، جا نموونه و ژمێرياريیە ئەفلاتۆنیزمەکان زۆر زۆرن، هەریەک لە شوێنکەوتووانی فیساگۆرس و ئەفلاتۆن و ئەرستۆ لە پەرپیاتێتیکەکانن، چونکە هەرکاتێک بابەتێکیان بۆ بسەلمێنرێت ئیدی هیچ لەو بابەتە هزرییانەیان بوونی نامێنێت مەگەر تەنیا وێنایەکی زەینی بەبێ هیچ بوونێکی واقعی."[1]

شەحروریش دەڵێت: "مەعریفەی مرۆڤەکان بۆ شتەکان بە دیاریکردنی بەش بەش دەست پێدەکات و بەدارنینی عەقڵی کۆتایی دێت."[2] ئەوەتا خۆی لێرەدا دان بەوەدا دەنێت کەهەموو بوونێک لە دەرەوەی هزر دەبێ بەرجەستە بێت، هەروەها دارنینیش بریتییە لە کردارێکی عەقڵی، کەوابێت کاتێک لێرەدا دەڵێت ئیسلام ویستویەتی خەڵکی لە ئاستی شتگەرایی (شیء) ببات بۆ ئاستی دارنین (التجريد)، بە قسەی خۆی بۆ (پەرستنی تاک و تەنیایەکی رەهای (المجرد))بووە، دەی لێرەدا پرسیارێک دێتە پێشەوە: ئاخۆ ئەم خوایە کە ئیسلام خەڵکی بۆ بانگ دەکات لای شەحروور شتێکی دیاری کراوە؟

لەراستیدا نکۆڵی ئەوە دەکات کە (الله) بریتی بێت لە شتێک (الشيء)، لەبەر ئەمەشە کە بە دژە واتای شتەکان دایناوە، جا لەوێدا شتان هەن، لەولاشەوە دارنراو هەیە (المجرد)، خواوەندیش لای ئەم بریتییە لە (المجرد)، بەڵکوو پێیوابوو کە هەرکەس باوەڕی وابێت (الله) بریتی بێت لە شتێک ئەوە شیرکە، دەڵێت: "ئەو شیرکە .کە لێخۆشبوونی بۆ نییە. ئەوەیە (الله) بە شت بزانیت، لەکاتێکدا ئەو لە هیچ شتێک ناچێت، پاک و بێگەردی بۆ (الله) لەو باسانەی لەبارەیەوە دەکەن."[3]

کەواتە لای شەحروور (الله) شت نییە، ئەی باشە ئەوەی لە دەرەوەی زەین

---

(١) منهاج السنة النبوية في نقض كلام الشيعة و القدرية، أحمد ابن تيمية، تحقيق: محمد رشاد سالم، جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية، الطبعة الأولى: ١٤٠٦ هـ ١٩٨٦م، (١٤١/٢).

(٢) الكتاب والقرآن، (ص٢٥٢).

(٣) الإسلام والإيمان، (ص٣٥١).

و عەقڵدایە هەر شت نییە؟

کاتێک شەحروور خۆی دەڵێت: "هەموو بوون بریتین لە شت."[١]

بەپێی ئەمەش بێت دارِنراوەکان (المجردات) لەڕاستیدا هیچ بوونیان نییە، چونکە لای ئەو تەنیا شتەکان پێیان دەوترێت بوون، بەڵام دانرِراوەکان (المجردات) کە تەنیا لە زەیندا هەن وەکوو هاوکێشە بیرکاریی و ئەندازیاریی و بگرە بابەتی خواش کە لە بابەتە زەینییەکانە لای شەحروور لە بنەڕەتدا بوونیان نییە! چونکە خۆی ئەمانە بە شت نازانێتو دەڵێت ئەمانە لە (مجردات)ن.

سەرباری ئەوەی کە وتەکانی شەحروور دژە واتای قورئانن، هێشتا لای ئیمامی بوخاریش لە صحیحەکەیدا باسێکی بە ناونیشانی باب: ﴿قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَٰدَةً ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ﴾[٢] لێرەدا خوای گەورە و میهرەبان زاتی موبارەکی خۆی بە (شیئ) ناوبردووە کە شتە![٣]

یەکەم کەس کە نکۆڵی ئەوەی کرد کە خوای گەورە شت بێت سەرداری جەهمییەکان «جەهمی کوڕی سەفوان» بوو، وتی: "ناڵێم خوای بەرز و بڵند شتە"[٤] کەوابێت ئاخۆ ئەمە چ سەردەمی بوونێکە کەشەحروور بانگەشەی دەکات تەنانەت لەسەر یاساکانی خۆشی؟! لەکاتێکدا وتەکانی جەهم بۆ زیاتر لە هەزار ساڵ پێش ئیستا بگەڕێتەوە!

(إبن القطان) دەڵێت:

(دەبینین کەخوای گەورە ناوی خۆی ناوە بەشت لە پەڕتووکەکەیدا

---

(١) الكتاب والقرآن، (ص٣٨٧).

(٢) سورة [الأنعام: ١٩].

(٣) صحيح البخاري، (ص١٨٣٠).

(٤) مقالات الإسلاميين، (٣٣٨/١)، وانظر: كتاب التوحيد، أبو منصور محمد بن محمد الماتريدي السمرقندي، تحقيق: بكر طوبال أوغلي، محمد آروشي، دار الصادرات، بيروت - لبنان، (ص١٧٨).

کاتێک دەفەرموێت: ﴿قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادَةً ۖ قُلِ اللَّهُ ۖ﴾[١]. ئەمەش ئەوە ڕووندەکاتەوە کە (شتە) و ئەمەش یەکدەنگی ئوممەتە.

جا کاتێک کە «جەهمی کوڕی سەفوان» دوای تێپەڕبوونی دووسەدە لەئیسلام پێچەوانەی ئەمەی کرد لەکاتێکدا کەهەموو خەڵکی ئەو سەردەمە یەکدەنگ بوون لەسەری، بۆیە «جەهم» بەڵگەی بەسەردا دەچەسپێت بەکۆ دەنگی ئەو دوو سەدەیە.[٢]

بۆمان دەرکەوت شەحروور تەنیا شوێنکەوتەی جەهمی کوڕی سەفوانە لەم بابەتەدا و شتێکی تازەی نەوت، بابەتی (الله = شيء) کۆڕایی ئوممەتی لەسەرە، لەولاوە شەحروور دێت بانگەشەی ئەوە دەکات کە ئەم بابەتە شیرکە و خوا هەرگیز لێی خۆش نابێت، دەی بەم دەرەنجامەش بێت ئوممەتی ئیسلام هەمووی موشریکە!

هەروەها لە گوتەی (گۆڕینەوەی خوا بۆ شت، لەکاتێکدا ئەو لە هیچ شتێک ناچێت)، لێرەشدا شوێنکەوتەی جەهمی کوڕی صەفوانە، چونکە ئەو بوو کە بیانووی بە ئایەتی ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ ۖ﴾[٣] دەهێنایەوە بۆ نکوڵی کردن لەوەی (خوا شت) بێت.

عوسمانی کوڕی سەعیدی الدارمی دەفەرموێت: "جەهمییەکان دەڵێن: هیچ شتێک لە خوا ناچێت کەچی مەبەستیان ئەوەیە کە خوا هیچ شتێک نییە بەپێی ئایەتی ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ ۖ﴾[٤] چونکە لە بنچینەدا دان بەوەدا

---

(١) سورة [الأنعام: ١٩].

(٢) الإقناع في مسائل الإجماع، علي بن محمد بن عبدالملك (أبو الحسن ابن القطان)، تحقيق: حسن بن فوزي الصعيدي، الفاروق الحديثية للطباعة والنشر، الطبعة الأولى: ١٤٢٤هـ ٢٠٠٤م، (٣٩/١).

(٣) سورة [الشورى: ١١].

(٤) سورة [الشورى: ١١].

نانێن کە خوا شت بێت، ئیتر چۆن شێوەی هەبێت؟ هەروەها سیفەتەکانی لای ئەوان هیچ نییە، جا بەڵگەیشیان بۆ ئەم ئەستەمگەری و خورافاتە بەتاڵە ئەوەیە کە ئایەتی ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾[١] دەکەنە پەردەی سەر نەنگییەکانیان و سەر لە نەزانەکان دەشێوێنن، بۆ گەرمکردنی بازاڕی گومڕایەتییان، جا ئەم ئایەتە وتەی حەق و ڕاستییە و ئەوان بۆمەبەستی ناهەق بەکاری دەهێنن، خۆ ئەگەر نەزانەکان بەهەڵەدا ببەن ئەوا بزانن کە تێگەشتووەکان لەسەر یەقیقنن بەرانبەریان."[٢]

لە ڕاستیدا لەو ئایەتەدا هیچ جۆرێک بەڵگەی تێدا نییە بۆئەو بۆچوونەیان، چونکە ئایەتەکە نکوڵی ئەوەی تێدایە کە هیچ هاوتا و هاوشێوە و نموونەیەکی تر نییە لە خوای گەورە بچێت، هەروەها پیتی (کاف) لە بڕگەی (كَمِثْلِهِ)دا ئامرازی دڵنیاییە، هەر چۆن ئیبن مالکی نەحوی دەڵێت:

**شَبِّهْ بِكافٍ وَبِها التَعْلِيلُ قَدْ يُعْنى وَزائِداً لِتَوْكِيدِ وَرَد**

(إبن عقيل) لە ڕاڤەی ئەو بەیتە نەحوییەدا دەڵێت: "بۆ (التوكيد) ئامرازی دڵنیایی بەکاردێت بۆ نموونە لە فەرمایشتی خوای گەورەدا لە ئایەتی (﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾[٣] واتا: «هیچ شتێک لەو ناچێت.» ئەو نەرێ کردنە نکوڵی نەبوونی هاوشێوە دەکات."[٤]

خۆ تەنیا جارێک نییە کە شەحروور هاوبیریی دەکات لەگەڵ جەهمییەکاندا، بەڵکوو لە بنەڕەتدا لەم بابەتەدا هیچی تازەی نەهێناوە وسەرلەبەری بابەتەکە

---

(١) سورة [الشورى: ١١].

(٢) رد الدارمي عثمان بن سعيد على بشر المريسي العنيد، صححه و علق عليه: محمد حامد الفقي، دار الكتب العلمية، بيروت-لبنان، (ص٢٠٨).

(٣) سورة [الشورى: ١١].

(٤) شرح ابن عقيل على الفية ابن مالك، علق عليه: قاسم الشماعي الرفاعي، دار القلم، بيروت-لبنان، (٢٢/٢).

شوێنکەوتەی جەهمییەکانە، ئەو وەڵامانەی ئەهلی سوننەت بۆ جەهمییەکان فەرموویانە دەتوانین کوتومت بیکەین بە وەڵام بۆ شەحروریش لە زۆربەی وتەکانیدا، بۆیە بەڕاستی شتێکی تازەی نەهێناوە تاوەکوو بڵێتخوێندنەوەی سەردەمیانەم کردووە، بۆ ئەم مەبەستەش فەرموو نموونەی تر بخوێنەوە:

شەحروور دەڵێت: "عەرش: بریتییە لە فەرمان و ڕێگرییەکانی خوای گەورە."(١)

لەم وتەشیدا هاوقسەی جەهمییەکانە، کە وتەیەکی کۆنە،(٢) بەرپەرچ و وەڵامیشان دراوەتەوە، فەرموو ئەو وەڵامە لە سەریان بخوێنەوە تا بزانیت شەحروور هیچ شتێکی تازەی نەهێناوە، (إبن قتيبة) بەڕەحمەت بیت دەڵێت:

"بۆ مانای عەرش جگە لە واتای تەخت شتی تریان داناوەو زانایانی زمانەوانیش بۆ مانای عەرش جگە لە تەخت مانایەکی تر شک نابەن، وە بەدڵنیاییەوە عەرش بریتی نییە لە سەقف و هاوشێوەکانی."(٣)

بە گەڕانەوەمان بۆ لای بیردۆزی پەرەسەندن بەپێی باوەڕی شەحروور کە پێیوایە مرۆڤ سەرەتا لەسەر شیرک بووە و پاشان پەرەی سەندووە بۆ تەوحید، لێرەدا دەوترێت: چ مانایەک دەمێنێتەوە بۆ وەحی لە دەرەوەی مرۆڤ؟ لە کاتێکدا هەر بە پەرەسەندن و بەبێ وەحیی توانیوەیەتی پێشبکەوێت، لەهەمان کاتدا هیچ مانایەک بۆ کاراکتەری وەحی نامێنێت، چونکە سیفەتی ئیلاهی داوە بە سروشت، ئەمەش هەر پێویست نییە بۆ ڕاڤەکردنی ماناکانی چەند خواوەندی و ناونانی هەموو خواوەندەکان، هەر چۆن ئەمیش هەر پێویست نییە بۆ گواستنەوەی مرۆڤایەتی بۆ پەرستنی خوایەک بە تەنیا، تا دواتر

---

(١) دليل القراءة المعاصرة، (ص٨٦).

(٢) انظر: الرد على المريسي، (ص٧١).

(٣) الإختلاف في اللفظ والرد على الجهمية و المشبهة، عبدالله بن مسلم بن قتيبة، قدم له وعلق عليه: عمر بن محمود، دار الراية، الرياض، الطبعة الأولى: ١٩٩١م، (ص٤٧).

دەوترێت: ئەوەبوو باوەڕی مرۆڤ پەرەی سەند لە چەند خواپەرستییەوە بۆ یەک خواپەرستی، چونکە لەم کاتەدا دەوترێت: "لەسەر ڕێڕەوی لابلاس کە وتی: گەورەم، گریمانە، هەرگیز پشتی پێ نابەسترێت وەکوو بەڵگە."[١]

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە: مرۆڤ بەهاتنی وەحی لە پێشکەوتن و پەرەسەندن نەوەستاوە، بەهەمان شێوەش بیری دارِنین (التجريد)یشیان بە هاتنی کۆتا پەیامبەر (ﷺ) ناوەستێت، ئایا ئەمە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە تەوحیدی خەڵکی لە تەوحیدی پەیامبەر زیاتر و پاکترە؟ یان لە هاوەڵانی بەڕێز زیاتر و پاکترە؟

شەحروور دەڵێت: "ئەگەر لەبارەی مرۆڤایەتیی ئێستا بڕوانین بۆمان دەردەکەوێت کە حاڵیان باشترە لە مرۆڤی پێشووتر لە بواری کوفرانەی خوا و شیریک گەراییدا."[٢] ئاخۆ ئەم باشییە تا چ ئاستێک دەڕوات؟ شەحروور دەڵێت:

"هۆشیاری گشتی لای خەڵکی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنی تر جیاوازە، لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تریش جیاوازە، جاکەس خەیاڵی ئەوە دەکات وێنای پەیکەرێک بکات بۆ وڵاتێک کە ئەم گۆڕانکارییانەی تێدا بنەخشێت و بدرەوشێتەوە، پێویستە لەسەرمان بزانین تێگەیشتن لە بابەتی تەوحیدیش پەرەسەندنی بەخۆیەوە بینیوە و لەم سەردەمەدا پێشکەوتووترە لە پێشوو. تەنانەت وێنایی (الله) لە زەینی خەڵکدا و بەپاکڕاگرتنی لەم سەردەمەدا زۆر لەپێشوو پێشکەوتووترە، بەڵکوو لەسەردەمی پەیامبەریش چاکترە."[٣]

---

(١) ديليكت الطبيعة، فريدريك إنجلز، نقله إلى العربية وقدم له: توفيق سلوم، دار الفارابي، بيروت-لبنان، الطبعة الثانية: ٢٠١١م، (ص٢٢٩، ٢٣٠).

(٢) الإسلام والإنسان، (ص١٦٧).

(٣) الإسلام والإيمان، (ص٣٧٨، ٣٧٩).

کەواتە مرۆڤایەتیی پەرەی سەندووە و لەگەڵیشیدا بابەتی تەوحید پەرەی سەندووە بۆ باشتر لەوەی پێشوو، تەنانەت باشتریش لەسەردەمی پەیامبەر و هاوەڵانی لە دیدگای شەحروورەوە، بەم پێیەش بێت کار ناگاتەوە ئەوەی مرۆڤ پێویستی بە وەحی بێت لەدەرەوەی خۆی بۆی بێت، بەو مەرجەی بەجوانی کار بکات و لە جیهانی گریمانە وەدەربێت، ئەم وتانە ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە شەحروور بۆچوونی وایە کە خوا و وەحی لە سنوورەکانی گریمانەدانەی زیادەن لەباشترین باردا، مەگەرنا بارەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئاستی هۆشیاریی خەڵکی، بەوەش وایدادەنێت کە (خوا و وەحی) بریتین لە بیری ڕەهای مرۆڤی، نەک بوونی هەبێت و کائینێک بێت، ئەمەش یەکێکە لە بنچینەکانی ئیلحاد لای زۆرینەی مولحیدەکان.

ئەوەتا ئیسماعیل ئەدهەم بۆچوونە ئیلحادییەکانی خۆی ڕوون دەکاتەوە و دەڵێت:

"بنچینەی بیر لەبارەی (الله) لە بارێکی زۆر سەرەتاییەوە پەرەی سەندووە، بەدڵنیاییەوە لە جیهانی فیکر و حاڵاتی خەیاڵ و وەهم و نەزانی و دەستەوسانی لەبەرانبەر ڕووداوە سروشتییەکانەوە ڕێچکەی گرتووە."(١)

دەی ئەم وتانە چ جیاوازییەکیان هەیە لەگەڵ وتەکانی شەحرووردا؟

شەحروریش دەڵێت: "بنەماکان لای هەندیک کەس: بریتییە لە پەڕتووکی حەکیم (قورئان) و سوننەتی پەیامبەر، لای هەندێکی تریش: پەڕتووکی حەکیم و صەحیحی سوننەت، لای هەندێکی تریش: پەڕتووکی حەکیم و سوننەتە گوفتاری یان کردارییەکانە."(٢)

---

(١) ملذا أنا ملحد: إسماعيل أحمد أدهم, مطبعة التعاون-الإسكندرية، ١٩٣٧م، (ص٨).

(٢) الإسلام الأصل والصورة، (ص٢٥).

ئەڵبەتە سەرباری نەنگی زمانەوانی لە وتەکانیدا، کاتێک کەسێک دەڵێت (سوننەت) حەتمەن مەبەستی ئەوەیە کە صەحیحە و چەسپاوە لە پەیامبەرمانەوە(ﷺ)، چونکە صەحیح نەبێت و نەچەسپێت نادرێتە پاڵ پەیامبەر(ﷺ) و بەسوننەت دانانرێت،ئەو سوننەتەش حەتمەن یان گوفتارە یان کردارە - لای هەمووان – ئیتر کەسێک وتی سوننەت، مەبەستی شتێکی تر نییە جگە لە وتار و کرداری پەیامبەر، کەچی شەحروور کردوویەتی بە سێ چەمکی جیاواز! ئێمە لیرەدا ئەم هەڵە زەقەش بەهەند وەرناگرین، با بزانین لەبارەی ئەم بنچینانەوە چی دەڵێت:

"زانایانی فیقهی پەرتووک فیقهیەکان لەسەر بنەمای بەڵگەی شەرعی و ئوسوڵ داناوە، ئەم بەڵگە و ئوسولانەش بەرهەم و ئەنجامی مرۆییە وسیفەتی باسێکی مێژوویی هەڵدەگرێت."(١)

ئەم کابرایە بەڵگە شەرعییەکان (کە قورئانی پیرۆزیشە) بە بەرهەمێکی مێژوویی دەزانێت و تەواو، نەک بەو بانگەشەیەی دەیکرد بڵێت قورئانی کەریم لای خواوە هاتووە و دابەزێنراوەتە سەر پەیامبەر(ﷺ) و وجودێکی هەقیقی لەدەرەوەی زەینی مرۆڤ هەیە!

هەروەها بابەتی تەوحید –کە لای شەحروور بریتییە لە دارِنینی تەواوەتی- لەنێوان پەیامبەراندا جیاوازە! جا دەڵێت: "لەسەردەمی ئیبراهیمدا (ﷺ) دیاری کردنی پەرستراو بڵاوبوویەوە، بەڵام مانا و مەبەستەکانی پەرستراوی دارِنراو (مجرد) هێشتا نارِوون بوو، هیچ ناوێکی نەبوو لەبەر نەبوونی توانای پێویستی عەقڵی لەسەر دارِنینی مانای پەرستراو لەلای خەڵکی ئەو سەردەمە."(٢)

لەسەر ئەم بنەما ناتەواوەی بێت پەیامبەرانی پێش ئیبراهیم (ﷺ) توانای

---

(١) الإسلام الأصل و الصورة، (ص٤٠).

(٢) القصص القران]، (١٠٤/٢).

هزرییان لە ئاستی عەقڵییەتی ئیبراهیم و دواتریشدا نەبووە، بابەتی تەوحیدیش جیاوازبووە لەنێوانیاندا لەبەر جیاوازی توانای عەقڵی نێوانیان و لە ئاستی گەیشتنبە ئەنجامی هزری لەمەڕ مانای پەرستراوی داڕنراو نەبووە پێش هاتنی ئیبراهیم، بۆ نموونە تەوحیدی نوح (ﷺ) جیاوازە لەوەی ئیبراهیم(ﷺ)!

لەڕاستیدا ئەم تێکەڵکردنە وێرانەی شەحروور لەم بوارەدا و بنەڕەتەکەیشی کە گوایە (الله) داڕنراوێکی ڕەهایە، لەدەوری سێ تەوەر دەخولێتەوە:

١. یان ئەوەیە داڕنراو بریتییە لە نەبوون، کە خۆی ئەوە دەڵێت: "ئەگەر وتمان (الله) عەقڵێکی ڕەهایە، ئەوە (الله) دەبێتە هیچ و نەبوو لەخۆیدا."[(١)] جا پێی دەوترێت: چۆن بڕیارت دا ئەگەر بە عەقڵی ڕەها دابنرێت مانای وایە هیچ نییە؟ ئەم پرسیارەش بە هیچ وەڵام نادرێتەوە مەگەر بڵێت ڕەهای داڕنراوە (المجرد)، ئەوکاتە دەبێتە هۆش و بیر بەتەنیایی، و لەکۆتایشدا لە واقیعدا هیچ بوونی نییە.

٢. یان ئەوەیە کە باوەڕی بە وەحدەتی وجود یان حلول هەبێت، کاتێک خوا بە بیرێکی ڕەها دادەنێت، ڕەهاش تەنیا لە بیرو هزردا هەبێت، دواتر هەوڵبدات لەدەرەوەی زەینیش بیسەلمێنێت، بانگەشەی ئەوەی کردووە کە ئەوەی لە دەرەوەی زەینی مرۆڤ هەیە بوونی خوایە!

٣. چەسپاندنی ئەوەی کە بڵێت لەدەرەوەی زەیندا بوونی نییە، هەروەها لەناو زەینیشدا تەنیا بوونێکی فیکر و هۆشییە نەک بەرجەستە و هەقیقی، کەواش بێت بە پێی پەرەسەندنیان پەرەدەسێنیت بەرەو خوایەکی داڕنراو، بەم پێیەش بیت کەواتە دانبەوەدا دەنێت کە لەدەرەوەی زەینی مرۆڤدا خوا بوونی نییە، دەی ئەمەش هەمان باوەڕ و بۆچوونی داریوینە.

جا شەحروور سێ پڕکانی لەنێوان ئەم سێ خاڵەدا دەکات و تێکەڵیشیان

---

(١) نحو أصول جديدة للفقه الإسلام]، (ص٣٨).

دەکات بەسەریەکدا، بەبێ ئەوەی خۆی لەسەر یەکێکیان یەکلایی بکاتەوە و بڵێت (الله) بوونێکی ڕەهای داڕنراوە و تەواو،دانبنێت بە بوونی خوای گەورەدا و لەدەرەوەی زەینی مرۆڤەکانە و ناو و سیفاتی جوان و تەواوی هەیە،دەبینێت و دەبیستێت و لەسەرووی عەرشدایە،جیایە لە هەموو بوونەوەران و بەدیهێنراوان. ئا ئەمە بیروباوەڕێکی ڕوونە، نەک ئەوەی لەولا شتیکی بۆ بچەسپێنن و لەملا شتیکی لێ دابتاشن، لێرە نکۆڵی شتانێک بکەیت وەکوو جەهمی کوڕی سەفوان، لەوێشدا شتانێکی بۆ بچەسپێنن کە هاوشیوەی هەبێت نموونەی چەسپاندنەکەی ئەفلاتۆن، کە داڕنراوە زەینییەکانە، لە واقعیشدا بوونی نەبێت.

جا بنەمای ئەوەی کە دەڵێت تەوحیدی ئەم سەردەمە باشترە لە تەوحیدی سەردەمی پەیامبەرایەتی لەبەر ئەوەی مرۆڤ پێشکەوتووترە لەبۆ داڕنینی ماناکانی خوا، هاومانای قسەکەی جەهمی کوڕی سەفوانە لە بابەتی ئیماندا، جا ئەگەر داڕنین بریتی بێت لە مەعریفە، ئەوا جارێکی تریش شەحروور هاو قسەی جەهمی کوڕی سەفوانە کە دەڵێت: "ئیمان: تەنیا ناسینی خوایە."[١] دەی ئەمە کەی خوێندنەوەی سەردەمیانەیە کە شەحروور هاواری بۆ دەکات؟

لێرەدا بابەتێک سەرهەڵدەدات ئەویش: ئەگەر داڕنین بریتی بێت لە زانین، ئیمان لای ئەو شوێنکەوتنی داڕنین بێت، کەوابێت مەرج نییە مرۆڤ موسڵمان بێت بۆئەوەی لەسەر هەق و ڕاستی بێت، بەمەش دەتوانێت لەجیاتی پەرستی (الله) بەتەنیایی دەتوانێت تەنیا داڕنین (التجرید) بکات و تەواو، لەسەر قسەکەی تری شەحرووریش کەدەڵێ: "بەشێک لە (الله) لە ناو مرۆڤدا بوونی هەیە." کەوابێت دەپرسین: ئاخۆ تێڕوانینی شەحروور بۆ دینەکانی تر چییە؟

دەڵێت:

"دەرگای ئازادیی دینداریی بۆ هەموو کەس والایە، مرۆڤ مافی خۆیەتی

---

(١) مقالات الإسلاميين، الأشعري، (٣٣٨/١).

هەر ئایینێکی بوێت هەڵیبژێرێت، چونکە لە کۆتاییدا هەموو ئایینەکان بریتین لە ئیسلام."[١]

ئیتر لێرەدا هەموو ئایینەکان دەکات بەیەک، بەڵکوو هەموویشی دەکات بە ئیسلام، بەمەش دەڵێت:

"ئایین بە هەموو جۆرەکانییەوە بریتییە لەوەی کە مرۆڤ دینداریی پێوە بکات لە ئەحکامە شارستانی و ڕەوشتییانەی کە چاکەکارییانی تێدا دەدرەوشێتەوە و ڕەنگدانەوەی دەگاتە سەر تاک و کۆمەڵگە، ئەوەش بریتییە لە مانای ئیسلام."[٢]

ئەوەتا ئیسلام دەکاتە مانای هەموو ئایینەکان ... هتد، گرنگترین شت بەلایەوە ئەوەیە کە ڕەوشت و یاسا شارستانییەکان بەرجەستە ببن!

جا ئەم کابرایە هەر خۆی بوو بە ئیبن عەرەبی دەگوت:"بە قسەکانی ئیسلامی کردووە بە گاڵتەجاڕی کە وتویەتی: جگە لە خوا نەپەرستراوە لە هەموو پەرستراوەکانی تردا."[٣] دەی سەیریکەن بزانن خۆیشی جگە لەوە چی دەڵێت؟ ئەی هاوار ئەگەر ئەمەی شەحروور دەیکات دژە یەک و تێکەڵ و پێکەڵ وچەواشەکاریی نەبێت ئیتر لەهەموو دونیادا چەواشەکاریی و دژەیەک بوونی نییە!

ئاخۆ چۆن بیروباوەڕی شەحروور ڕوون بکەینەوە جگە لە دووبارە هێنانەوەی دێڕە شیعرەکانی ئیبن عەرەبی کە دەڵێت:

---

(١) الإسلام والإنسان، (ص ١٢٤، ١٢٥).

(٢) الإسلام و الغنسان، (ص١٥٤).

(٣) الكتاب و القران، (ص١٣٣).

لقد صار قلبي قابلاً كلَّ صورةٍ فمرعى لغزلان و دير لرهبانِ
وبيت لأوثانِ وكعبةِ طائف وألواح توراة و مصحف قرآنِ

بەڕاستی قسەکانی بێ بەهاییەکی تەواوە، خۆ ئەگەر هەموو ئایینەکان هەق بن و هەندێکیان بەوانی تر دەڵێن لەسەر باتڵ و ناهەقن، قسەکەی واش دەگەیەنێ کە ئایینەکانی تر لەسەر باتڵن و ئەمەش ئەبێتە دژە واتای قسەکانی پێشووی، جا پێشوو لەسەر بابەتی ئیجتهادی ڕەهاش هەروایان دەگوت، (الصفدی) دەڵێت:

هەرکەس بڵێت: هەموو موجتەهیدێک هەرچۆن بڵێت بە ڕەهایی دەپێکێت ئەوە هیچ بەڵگەیەکی نییە، بە بەڵگەی وتەی: هەموو موجتەهیدێک پێکاویەتی.هەروەها ئەم وتەیەش زۆر ورد و تەواوە، چونکە بەڵگە لەدەستی بەرانبەر وەردەگرێت و خۆی پێوە پەیوەست دەکات بە مەبەستەکەیەوە و دەڵێت: بە پێی ئەوەی خۆت گوتت پەیوەستیت بەوەی کە من دەیڵێم، ئەگەر ئەوە بچەسپێنین کە هەموو موجتەهیدێک پێکاوییەتی، ئەوا منیش ئیجتهاد دەکەم و بە وتەی خۆت پێکاومە و ئیجتهادەکەشم ئەوەیە کە هەموو موجتەهیدێک ناپێکیت. )(١)

جا ئەگەر قسەکەی شەحروور کە دەڵێت: "هەموو ئایینەکان یەکن" لە بابەتە ئیجتهادییە سەمەرەکان نەبێت، ئەی بنەماکانی ئایین و دژەوتەکانی تری چی! جا خۆ خاچپەرست بانگەشەی ئەوە دەکەن کە مەسیح خوایە و هەرکەسیش باوەڕی بەوە نەبێت لە سەرفرازیی هەمیشەیی بێ بەش دەبێت،

---

(١) الغيث المسجم في شرح لامية العجم، واللامية للطغرائي و الشارح هو صلاح الدرين الصفدي، بهامشه: سرح العيون في شرح رسالة ابن زيدون لمحمد بن نباتة المصري، المطبعة الأزهرية المصرية، الطبعة الأولى ١٣٠٥ هـ ج١, (ص٨٣).

ئیسلامیش دەڵێت: ئەوەی بانگەشەی ئەوە بکات کە مەسیح خوایە کەواتە باوەڕداری بە تەنیایی خوا نییە، هەتاوەکوو باوەڕی بەوە نەبێت کە مەسیح بەندەیەکی دروستکراوی خوایە و ڕێزی پەیامی خوایی لێ گیراوە. دەی ئێستا ئەگەر بڵێین هەردوو ئایینەکە لەسەر هەقن، ئەوا قسەی خاچپەرستەکە لەسەر موسڵمانەکە ڕاستە و قسەی موسڵمانەکەش لەسەر خاچپەرستەکە دەبێتە ڕاست، دەی بەم شێوەیەش لە هەر یەکێکیان باوەڕدار و کافریشە، قسەی هەر یەکەیشیان لەسەر مەسیح ڕاستەبێت کە هەم بەندەی خوایە و هەمیش خوایە، ئا ئەمەش بریتییە لە سەفسەتە.

لەم کاتەدا کە شەحروور هەموو سنوورەکان بۆ هەموو ئایینەکان واڵادەکات، کەچی گرێ ڕق وتووڕەیی ناخی لەسەر ئیسلام هەڵدەقوڵێت، کە زانا گەورەکانی ئیسلام بەوە ناوزەد دەکات کە پەیامبەریان کردووە بە شەریکی خوا و کەوتوونەتە شیرکەوە، بە تاوانی قسەکردن بەناوی خواوە تۆمەتباریان دەکات، هاوشێوەی ئەمە!

جا لەبارەی داروینیزمیشەوە کە هەمیشە سەری دەخات وەکوو بڵێی هیچ ناتەواوی و ناهەقییەکی لەسەرەتا و ناوەند و کۆتاییشدا لێ ناوەشێتەوە،چەندین ئایەتی قورئانی بۆ لاردەکاتەوە، بۆیە لێرەدا جێی خۆیەتی پەردە لەسەر خوڕافات و نەنگییەکانی هەڵبدەینەوە کە بڵاوبووەتەوە لەنێوان لایەنگرانیدا، وەکوو بڵێی ئەمان لە پاپا زیاتر کاسۆلیکی بن،[1] ئەوەش ئەوەیە کە بیردۆزی داروین وەکوو وێنەی سەرەتایی خۆی نەماوەتەوە، هەرزوو زانست پەڕتووک و نووسراوەکانی داروینی تێپەڕاندووە، هەروەها تەماشاکردنی پەڕتووکەکانی تەنیا چەشنێکە پەڕتووکێک لە پەڕتووکەکانی مێژووی پەرەسەندنی زانستەکان، چونکە پێشکەوتنێکی زۆر بەسەر ئەو بوارەدا هاتووە لە دوای داروین، بەشێوازێک

---

(١) (وەکوو و بڵێی زیاتر لەپاپا کاسۆلیکی بن) وەکوو توانجێکەلەو پشتیوانی و خورافاتانە. (وەرگێر)

لەم بوارەدا هیچ شتێکی داروین نەماوەتەوە مەگەر ناوەکەی، هەموو کون و کەلێنەکانی ئەو بیردۆزە پڕکراوەتەوە.

لەوەیە بوترێت وانییە بەڵکوو بیردۆزی داروین هێشتا زاڵ و بەهێزە، ئەوەتا «ریچارد دوکینز» کە یەکێکە لە زانا بەناوبانگەکانی زیندەزانی و پشتیوان و هەوادارێکی سەرسەختی ئەم سەردەمەیە بۆ داروین و دەڵێت:" ڕاڤەی نهێنی بوونمانی شیکار کردووە لە بیردۆزەکەی داروینندا، ئەو زانیاریی و زانستانەی دوای خۆی بۆی زیادکراوە تەنیا هەندێک (تێبینی پەراوێزییە)،[1] لەسەر ئەم بنەمایەش گاڵەگاڵی خوڕافاتی ئەو وتەیە بڵند دەبێتەوە کە دەڵێت: "ئەوەی بیردۆزی داروین ڕوبەڕووی ڕەخنە بکاتەوە ئەوە باری ئەمڕۆی بیردۆزەکە ناگرێتەوە، ئەگەر چی بوونە هۆی بەهێزکردنی پایەکانی پیردۆزەکە، بەڵام هێشتا لە چەند تێبینییەکی لاوەکی زیاتر نین!

هەروەها بانگەشەی ئەوەی گوایە بیردۆزی داروین زۆر زانستییە بەڕاستی بانگەشەیە و نابێتە بەڵگە، چونکە خودی داروین بەرپەرچی ئەمەی داوەتەوە بە گوتەی: (پەندێکی کۆن هەیە دەڵێت: "هەرشت و باسێک بڵاوبویەوە مانای وایە ڕاستە، بەڵام ئەمە لە بواری زانستدا کاری پێ ناکرێت."[2] هەربۆیە بیردۆزەکەی داروین جیاواز لە بیردۆزەکانی پێش خۆی دواوە، لەبەر ئەمەش بوو داروین وتی: "ڕەخنەگر بۆی هەیە بپرسێت: بۆچی ئەو هەموو کەڵە زانایانەی سروشتناسی و زیندەوەرزانییە بەرپەرچی ئەم بیردۆزە دەدەنەوە بە تایبەتیلەبارەیی جۆرەکانی زیندەوەر بۆ گۆڕان؟"[3] وەڵام دەدرێتەوە: وا نابینم کە بە هیچ شێوەیەک لە شێوەکان هەوڵی ئەوە بدەم بۆ ڕازیکردنی هیچ کەسێک لە

---

(١) الداروينية الجديدة, صانع الساعات الأعمى, ريچارد دوكنز، ترجمة: مصطفى إبراهيم فهمي، دار العين للنشر، الطبعة الثانية: ٢٠٠٢م، (ص١٣).

(٢) أصل الأنواع: (ص٢٣٦).

(٣) أصل الأنواع، (ص٥٠٤).

زانایانی مێژووی سروشتناسی کە مێشکیان بە کۆمەڵێک بابەت و بنەما پڕ کردووە دوور لەو ڕاستی و واقعانەی کە خۆیان بەچاوی خۆیان بینیویانە بەدرێژایی چەند ساڵەی بیروبۆچوونیان لەکاتێکدا بەتەواوەتی دژ و پێچەوانەی دیدگای منە.)[1]

جا لەسەر ئەو بنەمایەی خۆی بێت ئەوەی پەسەندکراوە لەڕووی زانستییەوە مەرج نییە لە بیردۆزی ئەمدا پەسەند بێت، لێرەشەوە هیچ خۆی بە ناچار نازانێت کە ملکەچی ڕای زۆرینە ببێت لە بواری زانستیدا، تەنانەت کۆڕاییش لە بابەتێکدا بە بەڵگە نازانێت تاکو ناچار بێت بەباوەرهێنان پێی، بە بیانووی ئەوەی کە زانستێکی کەڵەکەبووە نەوەک زانستێکی چڕ بێت لە بوارەکەدا. وەکوو پێشتر باسکرا.

هەروەها یەکێک لە گرنگترین بیانووەکان کە داروین بە بنەمای بیردۆزی پەرەسەندنەکەی دایناوە ئەوەیە کە هەندێ ئەندامی جەستەی بوونەوەرە زیندووەکان هیچ ڕۆڵێکیان نەماوە و لە ئێستادا بەکاریان ناهێنێت، بەڵگەیە کە ڕۆژگاری ڕابردوو ئەو گیانلەبەرە پێویستی پێ هەبووە، ئیستا کە هیچ کاری پێ نەماوە، داروین ناوی لێناوە «ئەندامە پاشماوەکانی زیندەوەران»، چەند نموونەیەکیشی لەسەر هێناوەتەوە، دەڵێت:

"ناتوانین باوەڕبکەین کە ئەو پەردە پێستەیەی لەنێوان پەنجەکانی پێی مراوی و فیرگات هەیە هیچ سوودێکی مابێت، هەر چۆن ناتوانین باوەڕێکی ڕەهامان هەبێت ئەو پێکهاتە هاوچەشنانەی لە پەلەکانی مەیموونەدا هەیە، ئەو ئێسکانەی لە پێی پێشەوەی ئەسپدا هەیە، یان لەو ئێسکەی لە باڵی شەمشەمەکوێرەدا هەیە، وانازانین هیچ سوودێکیان هەبێت بۆ ئەم زیندەوەرانە، لەسەر ئەم بنەمایە دەتوانین ناوی بنێین کاریگەریی پاشماوەی بۆماوەیی،

---

(١) أصل الأنواع، (ص٥٠٥).

بەمەش متمانە و ڕازی بین بەو بۆچوونەمان."[١]

بەڵام ئەم بیانووەی کە - نەبوونی سوود لە ئەندامێکدا – بەسەریدا درایەوە لەکاتی ڕەخنە گرتن لە بیردۆزەکەی، کە خۆی لەبارەی ڕەخنەکانەوە بەهۆی ئەم (ئاوەژوبوونەوەی بیانووەکە بەسەر خۆیدا) دەڵێت: "لە ڕاستیدا ڕەخنەکانیان دژم بەهێزن لەم بارەیەوە."، لە بەشی حەوتەم: (پوچەڵکارییە جیاوازەکان لەبارەی تیۆری هەڵبژاردەی سروشت)، جا دەڵێت:

(بۆرن لەبەر ڕق و کینەی زۆر مەترسیدار و توند نارەزایەتی لەم قسەیە دەربڕیوە، دوای خۆیشی زانای گەورە «برۆکان» پشتیوانی ڕەخنەکانی ئەوی کردووە، کورتەکەی ئەمەیە: بەدڵنیاییەوە هەندێ سیفەت کە ئاماژەی ڕووکەشی ئەوە بگەیەنیت کە هیچ پێویستییەکی زیندەوەرەکەی پێوە بەند نییە، بەوە مانا بکرێت کە بۆماوەیی و پاشماوەی ڕابردوویانە هیچ پەیوەندی بە هەڵبژاردنی سورشتی گونجاوەوە نییە، جا مامۆستا «براون»یش پشتیوانی ئەم وتەی کردووە بە چەند شتێکی بەرچاوی وەکوو درێژی گوێی کەروێشک یان درێژی کلکی مشک، یان ئەو چینە ئاڵۆز و بەهێزانی لە مینای دانەکانی هەندێ گیانلەبەردا هەیە، جگە لەمانەش لە هەر دیاردەیەکی بینراوی زیندەوەراندا دەکەن بە پشتیوانی ڕەخنەکانیان دژی تیۆرییەکەی داروین، داروینیش دەیوت: "بەڕاستی ئەم ڕەخنانەیان دژم زۆر بەهێزن.")[٢]

ئەم ڕەخنەیە دەڵێت هەندێک ئەندام لە زیندەوەراندا هەیە ناکرێت بەوە پۆلێن بکرێت کە بابەتێکی پاشماوەی بۆماوەییە و لەهەمان کاتدا بوترێت هیچ سوودێکی نییە. نموونەی درێژیی گوێ و درێژیی کلک، هیچ سوودیان نییە نەلە ئێستادا و نەلە ڕابردوودا! بۆیە دروست نییە بوترێت کە کاری (هەڵبژاردنی

---

(١) أصل الأنواع، (ص٣٥٢).

(٢) أصل الأنواع، (ص ٢٦٥-٢٦٦)

سروشتی گونجاوە) کە بوونەوەر سیفەتەکانی بەپێی پێویستییەکانی پەیدا دەکات، چونکە بەو پێیە بێت ئەو ئەندامانە لە بنەڕەتدا هیچ سوودیان نەبووە، ئیتر بۆ پەیدابوون؟!

لێرەدا داروین وەڵام دەداتەوە:

(وانازانم پێویستم بەوە بێت ڕووبەڕووی ئەو توێژەرانە بوەستمەوە کە سینگیان دەرپەڕاندووە بۆ بانگەشەی ئەوەی کە بێژەران بانگەشەی دەکەن لەبارەی بوونی هەندێک ئەندام یان بەشێکی ئەندامی بێنیاز لە زیندەوەراندا، کە گوایە پێکهاتەی هەمەچەشن ڕوویداوە لە زۆرێک لە گیانلەبەرە باڵا ناسراوەکانی بەردەستمان گوایە باشترین و وردترین زانیاریی بێت، لەکاتێکدا هێشتا لەکاتی گەشەکردندا هیچ کەسێک گومانی لەوەدا نییە کە لە بەهێزترین پێکهاتەکانن لەڕووی ترسناکی و سوودبەخشیدا، لەکاتێکدا کە ئێمە پێشتر نەگەیشتین بە سوودەکانی ئەم ئەندامانە، لەوانەشە لەم ماوە نزیکەی ڕابردوودا گەیشتبین بە ڕوونکردنەوەی گرنگییان.)[1]

دواتر دەستی کردووە بە لێکدانەوەی سوودەکانی درێژی کلک و گوێ بە پێیی تازەترین دەرکەوتەکان.

لێرەدا دەڵێت: "نەزانینمان بە زۆرێک لە سوودەکانی ئەندامانێکی جەستە مانای وانییە کە سوودیان نەبێت، چونکە لەم دواییانەدا چەندین سوودمان بۆ دەرکەوتووە بۆ هەندێک ئەندام کە پێشتر هیچمان لەبارەوە نەدەزانی."

خۆی ئەم وتەیەی ڕاستە، بەڵام ئاخۆ هەر خۆی نەبوو وتی بوونی ئەندامانێکی بێ کەڵک لەئێستادا ئەوە دەگەیەنێت کە لە ڕابردووی دووردا سوودی هەبووە لە باوانی ئەو بوونەوەرە، پاشانیش حوکمی ئەوەی بەسەرییدا دا

---

(١) أصل الأنواع، (ص٢٦٦-٢٦٧).

کە ئەندامی پاشماوەی بۆماوەییە، نموونەشی بۆ هێنایەوە وەکوو ئەو پەردەی نێوان پەنجەکانی مراوی لە بەرزاییەکاندا!

ئەی چ دەبێت کە پێی بوترێت: ئەم وەڵامە تازەیەت بۆ ڕەخنەکانی سەرت دەبێتە وەڵام بۆ خودی بانگەشەکەی سەرەتات کە پێتوابوو پێستەی نێوان پەنجەکانی مراوی بێ بەهایە لە ئێستادا، دەی خۆ دەکریت سبەی چەندین سوود بۆ ئەم پەردەیە لێکبدرێتەوە، لەسەر ئەو بنەمایەی خۆت کە دەڵێیت:"ئەمڕۆ هیچ لەبارەیەوە نازانین"، دەی بۆ بانگەشەی بێ بەهاییت بۆی دەکرد؟ بەڵکوو زیاتریشت گوت کەگوایە لە پێشوودا سوودی هەبووە بۆ باوانی مراوییەکان کە بۆ مەلەوانی لەنێو ئاوەکاندا سوودیان لێ بینیوە!

لێرەدا داروین کەوتووەتە دژە یەکییەوە لەبەکارهێنانی زاراوەی (نەزانینی سوود)ی ئەندامان، چونکە نەزانینی سوود مانای بێسوودی شتەکان نییە، لە کاتێکدا خۆی بەرپەرچی ڕەخنەکانی سەری دەداتەوە بە هەمان بیانووی خۆی و بەڵگەی ئەوان کە بریتییە لە دەربڕینی (ئەو سوودانەی کە ئەمڕۆ نایزانین لەوانەیە سبەی بۆمان دەربکەوێت)، دەی ئەمەش بەرپەرچی بۆچوونەکەی دەداتەوە کە دەڵێت: "ئەندامە پاشماوە بۆماوەییەکان"، یان ئەوەی بەسەردا دەمێنیتەوە کە لەبارەی ڕەخنەکانی (زانا براون) گوتی: بەڕاستی ڕەخنەکەی لەدژم زۆر بەهێزە. ئەمەش بەڵگە بەهێزەکەی تیۆرەکەی بوو.

جا زانا «دۆکینز»یش وەڵامی داروین دەداتەوە و دەڵێت: "ئەگەر گەورەترین زانای زیندەزانیش دەستەوسان بێت لەبارەی ڕاڤەکانی دیاردەیەکی زیندەگانی تێبینیکراو، ئەمە مانای ئەوە نییە کە هیچ ڕاڤەیەکی نییە، چونکە لەوێدا نهێنی گەلێکی زۆر ماون بەدرێژیی سەدەکانی ڕابردوو، پاشان ملکەچ بوو بۆ یەکێک لە ڕاڤەکان."[١]

---

(١) الداروينية الجديدة، (ص٦٩).

سەرباری سەرقاڵی زۆرێک لە زانایانی تاقیکاریی بە زانستەوە، لەوانەیە فەلسەفە کۆتا بابەت بێت کە بیانپەرژێتە سەری بۆ دەستکەوتنی هەندێ سوود، جا هەر لەم چەشنە بۆچوونەوە زانا «ڕیچارد» فرایدمانی گەیشتوو بە خەڵاتی نۆبڵی فیزیایی ساڵی ١٩٦٦ی زاینی دەڵێت:

"بەدرێژاییی تەمەنم ئەزموونی زانستم کردووە و دەزانمیش زانست چییە، بەڵام بێ توانام لەوەڵامدانەوەی پرسیاری (زانست چییە؟)"[١] ئا لێرەدایە کە فەیلەسوفەکان دەستەوسانن لەبارەی ڕوونکردنەوەی پرۆگرامی زانستیدا، ڕونکردنەوەی مانا و پێبەندەکانی، جا لەنێو ناسراوترینیاندا زانا «کارڵ» بوپرە کە (پێوەرێکی ڕەهای دانا بۆ جیاکردنەوەی ئەوەی زانستییە و ئەوەی نازانستییە."[٢] ئەو کەسەیە کەدەڵێت: "هەر تیۆرییەک دەکرێت فراوان و گشتگیرییەکەی هەر لە فراوانبووندا دەبێت، بەپێی بەرزبوونەوەی ئاستی سنووردارکردنی ئاستی شیان و ئاستی بەکەڵکیشی زیاد دەکات."[٣]

هەروەها (کارڵ بۆبر نموونەیەکی تر دەخاتەڕوو: دوای چەندین جار پێداچوونەوە لە چەندین باری جیاوازدا لەسەر قەلەڕەش، دەرەنجام لەسەر ئەو ڕەنگە ڕەشەی کە قەلەڕەش هەیەتی بوترێت: "هەموو قەلەکان ڕەشن"، «بۆبر» ئەم دەرەنجامە بەرپەرچ دەداتەوە و دەڵێت: قەلەسپیش بوونی هەیە، کەوایە یاسای (هەموو قەلێک ڕەشە) یاسایەکی هەڵەیە)[٤] جا ئەو گشتاندنەی باسکراوە لەو بنەمایەدا دەبێ پشتڕاست بکرێتەوە، چونکە دانانی هەموو

---

(١) فلسفات عصرنا، تياراتها، مذاهبها، أعلامها، قضاياها، جان فرانسوا دوورتيى، ترجمة: إبراهيم صحراوي، الدار العربية للعلوم ناشرون، بيروت-لبنان، الطبعة الأولى: ٢٠٠٦م, (ص٢٩٣).

(٢) فلسفات عصرنا. (ص٣١٠).

(٣) منطق البحث العلمي، كارل بوبر، ترجمة و تقديم: د.محمد البغدادي، المنظمة العربية للترجمة، بدعم من مؤسسة الفكر العربي، توزيع مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، الطبعة الأولى: شباط (فبراير) ٢٠٠٦م، (ص١٧٠).

(٤) فلسفات عصرنا، (ص٣١٣).

قەلەکانی جیهان، هەرچی قەلی شوێنە جیاوازەکانە بە قەلەڕەش ئەستەمە، لێرەشەوە ڕوون دەبێتەوە کە پشتڕاستکرنەوەی ئەم یاسا بچووکە ئەستەوە و دەکرێت بوترێت ئەم گشتاندنە هەڵەیە، ئەی چی لەبارەی یاسایەکەوە بڵێین کە بەسەر هەرچی جۆرەکانە بگشتێنرێت! نیگای ئەوە بکە وتەیەک بۆ هەموو مەوجود و بوونەکان بگشتێنرێت، فەرموو پێکەوە بخوێنینەوە کە دۆکینز بەو ڕەهاییە دەدویت و دەڵێت:

"بۆچوونی داروینی ڕاستە، بەڵکوو بەسەر هەموو گەردووندا ڕاستە بۆ هەرچی شوێن و جێگەیەک کە ئەگەری ژیانی هەبێت."[١]

دەی ئەم گشتاندنە بەراورد بکە لەگەڵ یاسا هەڵە گشتێنراوەکەی (هەموو قەلێک قەڵەڕەشە)دا، ئەمیش دەڵێ تەنیا تیۆرییەکەی داروین بۆ هەموو گەردوون و هەموو هەسارەکانی جگە لەزەویش بەس ژیانی تێدابێت دەشێت! بەو پێچ لێدانەی کە دەڵێ بەمەرجێک هەسارەکە ژیانی تێدا بێت، لەوێوە تەنیا لەسەر باوەڕەکان قسان دەکات نەک لەسەر بنەما زانستییەکان، لەبەر ئەمەشە کە دۆکنز پێداگیرە لەسەر ئەوەی لەسەر قسەکانی خۆی بڵێت:"ئامانجی تەنیا بەخشینی زانیارییە، بەڵام لەهەمان کاتدا ئامانجی ڕازی کردنی بەرانبەریشە."[٢]

جا کارڵ بوبر زۆری ڕاڤەکاریی بۆ زۆرێک لە تیۆرەکان بە خاڵی هێز نازانێت بەڵکوو دەڵێت: پێدەچێت هەڵگرتنی ئەم هەموو لێکدانەوەیە لەبەر لاوازی بێت نەوەک هێز، چونکە وا دێتە پێش چاوان کە ببنە پاڵنەری هەڵەی ڕەها،هەر گرفتێکی لەپڕ کە تووشی تیۆرییەکە دەبێت لەوەیە ڕاستییەکی

---

(١) الداروينية الجديدة، (ص١٤).

(٢) الداروينية الجديدة، (ص١٤).

بەرجەستە بێت لە تیۆرییەکە،[١] لەمەشەوە دەست دەکرێت بە تەئویلی ناوەکی تیۆرەکە بەلای ئەنجامەکەدا، جا ئەگەر شوێنەوارێک هەڵکۆڵن و هەڵکەنن و گیانلەبەرێکی چوار پێی بەبەردبوو بدۆزنەوە دەکەونە ویزەی ڕاڤە و تەئویلی ناوەڕۆکی تیرۆەکە بۆی، بە پێچەوانەشەوە ڕاستە، جارێک بەوەی بوترێت: (ئەو بەبەردبووە پێشینە، جارێکیش بڵێن بەڵکوو جۆرێکە کە لە گیانلەبەرەکان کەوتۆتەوە و تیاچووە، خۆ ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ هەڵکۆڵین و هەڵکەندنەکانی پێشوو هەمان قسە دەکەنەوە، دەی ئەمەش توانای پشتڕاستکردنەوەی تیۆری لاواز دەکات، بەمەش دەبێتە خاڵێکی لاواز بۆی.

ئەوەتا نیچە پێشتر لەسەر تیۆری داروین وتی: "بانگەشەکان بۆ تیۆرییەکە زیاترە لە هێنانی بەڵگەکان بۆی."[٢]

لەڕاستیدا تیۆرییەکەی داروین لەواقیعدا ڕەنگدانەوەی زۆرێک لە فەلسەفەکانی سەرمایەداریی بوو لە سەدەی نۆزدەیەمدا، ئەوەتا دۆکنز دەڵێت:

"بلیمەتی داروین لەوەدا بوو کە بۆچوونە جیاوازەکانی -ئابووری- پێکەوە گرێ دەدا، تۆماس ماڵتوس ئەوکاتە وتارێکی زۆر بەهێز و بەپێزی نووسی لەسەر ترسناکی زۆربوونی دانیشتوانی بەریتانیا لەوکاتەدا،چۆنیش ئەم زۆربوونە دەوەستێت بەهۆی نەخۆشی و نەبوونی خۆراکی پێویستەوە، داروین لێرەوە ئەو برگانەی لە هۆشیارییدانەکانی ماڵتوسەوە هەڵگۆزی و تیۆریی ململانیکانی مرۆڤی لەسەر خۆراک دارشتەوە، ئەوەشی بە چەشنێک جێ بەجێکاریی ڕوون کردەوە لەسەر سروشت."[٣] ئەمەش بەو شیوەی کە داروین دەربڕی و گوتی:

---

(١) الداروينية الجديدة، (ص٣١٣).

(٢) أفول الأصنام، فريدريک نيچه، ترجمة: حسان بورقية، محمد التاجی، أفريقا الشرق، الطبعة الأولى: ١٩٩٦م، (ص٩٠).

(٣) يوتيوب: عبقرية داروين، ريچارد دۆكينز، (الحلقة: ١، دقيقة: ٢٦).

"پێشکەوتن و خۆشگوزەرانی تایبەت بە مرۆڤایەتی یەکێکە لە گرفتە زۆر پێچراوەکان: چونکە ئەوە دەسەپێنێت کە هەموو ئەوانەی کە ناتوانن منداڵەکانیان لەهەژاری دووریخەنەوە، دەبێت ڕاپێچبکرێن و گۆشەگیر بکرێن لە نزیکبوونەوەی ئەوانی تر، چونکە هەژاری تەنیا نەگریسییەک نییە و ببڕێتەوە، بەڵکوو هەمیشە ویستی زیادبوونی هەیە."[١]

لێرەوە جڵەو بۆ مارکس ئازاد دەبێت کە بەتوندی کۆمەڵگەی بەریتانی ڕەخنەباران بکات و بڵێت:

"ئەم داروینەی — کە بەم تازەییانە لەبارەیم خوێندووەتەوە - دەمخەڵا فێنیّ بەوەی دەڵێت: گوایە تیۆری (ماڵتوسی) جیّ بەجیّ دەکات لەسەر ڕووەک و گیانلەبەرانیش، وەکوو بڵێیت بابەتەکە سەرلەبەر لای بەڕێز ماڵتوس لەسەر ڕووەک و گیانلەبەران جیّ بەجیّ نەبێت بەڵکوو لەسەر کائینە مرۆڤییەکان جیّ بەجیّ ببێت، لە ڕاستیدا جێی تێڕامانە ئاخۆ چۆن داروین زانیاریی لەنێوان گانلەبەران و ڕووەکدا دەکات بەسەر کۆمەڵگەی ئینگلیزییەوە بەچەشنێک هەموو ئەمانەی بەسەردا کۆببێتەوە: پۆلێنی کردار، کێشمەکێش و کۆمەڵبوون، کردنەوەی بازاڕی تازە، داهێنانەکان، ململانیّ لە پێناو بووندا، ئەمە لە ڕاستیدا جەنگی گشت لەگەڵ گشتدا دێنێتە کایەوە وەکوو هۆبس جاڕی بۆ دەدا."[٢]

«ئینگڵ»یش شوێنی مارکس کەوت و دەڵێت:

"بەدڵنیاییەوە هەموو تیۆرییەکەی داروین لەبارەی ململانیّ لەپێناو مانەوەدا بریتییە لە گێڕانەوەی تیۆرییەکەی «هۆبس» کە جەنگی گشت دژ بە گشت بوو،تیۆری بۆرجوازی لەسەر کیّ لەبەرکیّ؟ هەروەها تیۆری «ماڵتوس» لەسەر

---

(١) نشأة الإنسان، (٣/٢٣٨).

(٢) مراسلات ماركس-إنجليزي، ترجمة: فؤاد أيوب, دار دمشق للنشر و التوزيع، الطبقة الأولى, ١٩٨٣م، (ص١٤٦).

مرۆڤ لە کۆمەڵگەوە بۆ سروشت."(١)

تیۆری بورژوازی هێندەی گرنگی بە ڕێژەی قازانج دەدات ئەوەندە گرنگی بە لایەنی باوەڕەکان نادات، لێرەشەوە تیۆری براغمایی یەکێکە لە فەلسفەکانی کە دەڵێت:

"هەموو بیرێک ڕاست دەبێت، بەو مانایەی کە لە ڕووی عەقڵییەوە پشتڕاست بکرێتەوە لەبەر ئەوەش باوەڕبوون پێی بە سوود و قازانج بۆ ژیانمان دەگەڕێتەوە."(٢)

هەر ئەمانەی سەرەوەن کە لە موحەممەد شەحروورردا ڕەنگیان داوەتەوە، کەوای لێ کردووە بانگەشە بۆ «لیبراڵییەتی ئیسلامی» بکات.(٣) (کە بوار دەدات بە فرە حزبی وئازادیی ڕادەربڕین)،(٤) دواتریش دەڵێت: "وادەبینین کە دەوڵەتی ئیسلامی خودی دەوڵەتێکی عەلمانییە بۆخۆی."(٥) کە ئەوە بەدوای خۆیدا دەهێنێت دەوڵەت زۆر دەستوەردان لە بواری ئابووریدا نەکات، ئەمەش بەردەوامی و خولانەوە بە سەرمایە دەبەخشێت، کە بریتییە لە خولانەوە لە خولگەی فەلسەفەکانی بۆرژوازییدا.

جا ئەگەر ئەوەی کە تیۆری داروینی لە ئابووریی مرۆڤایەتییەوە دەیگوێزێتەوە بواری گیانلەبەران و ڕووەکەکان بگرێتەوە، ئەوا سەرەتا دەبێت مرۆڤ بگرێتەوە، لێرەشەوە خۆ ئەگەر پەڕتووکی (أصل الأنواع = بنچینەی جۆرەکان) لە یەک بەرگدا چاپکرابێت، ئەوا پەڕتووکی (نشأة الإنسان = سەرەتای مرۆڤ) لە سێ

---

(١) دیلکتیک الطبیعة، فریدریک نیچە، (ص٣٥٩).

(٢) الراجماتیة، ولیم جیمس، ترجمة: محمد علي العریان، تقدیم: زکي نجیب محمود، المرکز القومي للترجمة، القاهرة-مصر، ٢٠٠٨م، (ص٩٩).

(٣) الدولة والمجتمع، (ص١٩٨).

(٤) الدولة والمجتمع، (ص١٩٧).

(٥) الدولة و المجتمع، (ص١٩٧).

بەرگدا چاپکراوە، دەی لەو میانەدا ئەگەری بوونی مرۆڤی پێشکەوتوو هەیە، لەوەشە هێشتا مرۆڤی ناهۆشیار و هەمەج هەبیت، لەم سنوورەشدا بیری «نازیی» سەریهەڵدا، خۆ لەخۆڕا ناوترێت گوایە «نازییەت» داروینی جووڵاندبێت بۆ ئەم بیرانە، بەڵکوو خودی داروین دەڵێت:

"گرنگی بە سەردەمەکانی سەرەتا دەدەین، بەڵام تاکە هۆکار بۆ گەیشتن بە باشترین بڕیار لەم بارەیەوە ئەوەیە کە لە ڕەفتاری کۆمەڵگە نیوچە شارستانییەتەکان و کۆمەڵگە ناهۆشیار و هەمەجەکانی ئێستا بکۆڵینەوە."(١)

جا هەر لەم باسوخواسەدا هیتەر دەڵێت:

"جا لەبارەی زاراوەی ڕەگەزپەرستی وڵاتمانەوە بەو پێیەی حزبمان دیاری کردووە بەپێی بەهاکانی ڕەگەزە سەرەتاییەکان دەپێورێت، هەروەها دەوڵەتمان پەیامێکی ڕوونی وەکوو بنەمای خۆی ئاشکرا دەکات کە بریتییە لە پارێزگاری لە پێگەی ڕەگەزی مرۆڤی، بیری ڕەگەزپەرستیمان هیچ باوەڕی بە یەکسانی ڕەگەزەکان نییە، کە ئەمەش سەر بۆئەوە دەکێشێت کە پشتیوانی مانەوەی باشترین و بەهیزترین ڕەگەزەکانی مرۆڤ بکاتەوە، لاوازەکان ملکەچی بەهێزەکان بن، لەگەڵ ئەمانەشدا لەسەر بنەمای ئەستۆکراتی بۆ سروشت دەڕوانێت."(٢)

ئەمە قۆستنەوەی تیۆرییەکە نییە، بەڵکوو پراکتیزەکردنی تیۆرییەکەیە، ئەوەی دەمێنیتەوە وێنەی بەرجەستەیەتی ماوە بە ماوە لە لێدوانە داروینییەکاندا دەردەکەوێت، دۆکینز دەڵێت: "پێموابێت ئێمە لە هەڵکەنراوەکاندا پێشبرکێی بەهێزبوون دەبینین، یان ڕوونتر بڵێین زنجیرەیەک لە پێشبرکێی بەهێزبوونی سەرەتایی دەبینین لە گۆشت خۆرەکان و ڕووەک خۆرەکاندا، ئەمەش بەتەواوەتی

---

(١) نشأة الإنسان، (١٤٩/٣).

(٢) كفاحي، أدولف هيتلر، ترجمة: لويس الحاج، بيان، الطبعة الثانية: ١٩٩٥م (ص٢١٢).

هاوتا و هاوسەنگییەکی سەرسوڕهێنەرمان پیشان دەدات لە بەهێزبوونی مرۆڤی."[١]

پاش ئەمەش هەندێک دەبینیت کە گڕی بەرداوەتە تیۆرییەکە و باسی یەکسانی مرۆڤایەتیش دەکات، دەی خۆ یەکەم کەس کە نکۆڵی یەکسانی مرۆڤی کردبێت تیۆرەکەی داروینە کە لە کون و کەلەبەرەکانیدا دێوەزمەی نازییەتی حەشارداوە، دەڵێت: "تیۆری داروین لە ساتەوەختێکدا دەرکەوت کە وڵاتە زلهێزەکان سەرقاڵی دامەزراندنی ئیمپراتۆرییە داگیرکاریەکانیان بوون، جا ئەم پیاوە سپی پێستە ئەم تیۆرییەی کردووە بە بیانووی هەرچی کاری ڕەگەزپەرستی خۆی هەیە لە دژی خەڵکانی جگە لە ڕەگەزی خۆی."[٢]

ئەگەرچی شەحروور خۆی دوور دەخاتەوە لە هەر جۆرە جیاکارییەک لەسەر بنەمای ئایینی، بەڵام پێویستە لەسەری کە هەمیشە لەبیری بێت کە: (دابەشکاری لەسەر بنەمای ئایینی زۆر مرۆڤایەتیانە ترە، چونکە هەمیشە دەتوانرێت ئەو بۆشاییە نەهێڵرێت کە ئایینەکان لەیەکتر جیادەکاتەوە، بەڵام ئەو بۆشاییە بایۆلۆژییەی کە ڕەگەزەکان لەیەکتر جیادەکاتەوە، هەرگیز ناتوانرێت بنەبڕ بکرێت.)[٣]

جا پێش ئەوەی بچینە سەر بابەتێکی تر، دەوترێت: ئاخۆ تا چ ئاستێک دیدگای شەحروور بۆ تیۆری داروین ڕاست بووە؟ چونکە هەر شەحروور بوو دەیوت تیۆری داروین زۆر باشترە لە بەڵگەی ئایەتە یەکەمینەکانی قورئانی پیرۆز.

---

(١) الداروينة الجديدة، (ص٢٥٩).

(٢) خرافات عن الأجناس، جوان كوماس، ترجمة: محمد رياض، مؤسسة هنداوي للتعليم والثقافة، القاهرة، (ص١٢).

(٣) خرافات عن الأجناس, (ص١٠).

ئەمەش لە وتەکانی شەحروورد دەردەکەویت کە دەڵێت: "جا داروین باوەڕی وابوو کە باپیری مرۆڤ بریتییە لە مەیموون."(١) (گرنگترین جیاکراوەی تیۆری داروین ئەوەیە، مەیموون و پەرەسەندیەتی بۆ مرۆڤە.)(٢)

سەیر ئەوەیە کە شەحروور کەمێک خۆی ماندوو نەکردووە تا بگەڕێتەوە بۆ پەڕتووکەکانی داروین تا بزانێت چی وتووە و چی داوەتە پاڵ داروین، بەڵکوو بۆ ئەم هەموو قسانەی کردوویەتی گەڕاوەتەوە بۆ بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی(٣) کە لە کەناڵی الجزیرەوە پەخش کراوە،(٤) وەکوو دەڵێت لە پێگەی الجزیرەدا هاتووە کە دەڵێت: "یەکێک لەو هەڵە چەمکیانەی لەسەر زاری زۆرینەی کۆمەڵگە دووبارە دەبێتەوە و دەبیسترێتەوە ئەوەیە کە دەڵێن گوایە داروین وتبێتی: بنچینەی مرۆڤ بریتییە لە مەیموون، یان مرۆڤ ڕاستەوخۆ نەوەی مەیموونە."(٥)

دە ئەوەتا داروین ئەمەی بە ڕوونی لە پەڕتووکی (نشأة الإنسان = سەرەتای مرۆڤ) دەڵێت: "جۆرە تایبەتەکە بە خۆمان، نزیکترین شت لێوەی دوو جۆر مەیموونە چەشنی مرۆڤی ئەفریقییە، کە بریتین لە شامپانزی و غۆرێلاو گیانلەبەری مرۆڤی لەگەڵ مەیموونەدا لە باپیرێکی دوورەوە هاوبەشن."(٦)

ئەوەتا داروین بە ڕوونی دان بەوەدا دەنێت کە باوەڕی وایە مرۆڤ و مەیموون لە باپیرەیەکی دووردا هاوبەشن، نەک مرۆڤ نەوەی خودی مەیموون بێت. بەهەر حاڵ ئەمانە هەمووی ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە شەحروور هیچ

---

(١) القصص القراني، (٢٥٣/١).

(٢) القصص القراني، (٢٤٣/١).

(٣) القصص القراني، (٢٤٣/١).

(٤) القصص القراني، (٢٤٥/١).

(٥) من على موقع: الجزيرة نت, بعنوان: (٥ خرافات صدقها الناس عن (داروين) وأثارت جدلا).

(٦) نشأة الإنسان، (٥١/١).

ئاگاداریی و زانیاریی نەبووە لەسەر ڕاڤەی ئایاتەکانی قورئان، لەولاشەوە زۆر ئاگاداری بۆچوونەکانی داروین نەبووە، جا بەڕاستی نە لەم تێگەیشت و نە لەوی تر. جا پێدەچێت کاک شەحروور بەم قسە بێ سەروبەرانە بیەوێت پێمان بڵێت: "ئەمانە خوێندنەوەی تازەن لەوبوارەدا!"



## جاڕنامەی جیهانی - بەهاکانی خۆرئاوایی:

پاش ئەوەی شەحروور تەواو بوو لە بانگەشەکانی ئیسلامەتی کە بە دژایەتی زاناکان دەستی پێ کرد، و هەڵیکوتایە سەر بیر و باوەڕەکانیان بۆئەوەی بە ئارەزووی خۆی یاری بە ڕا و بۆچوونەکانی بکات کە هیچ بازنە و سنوورێک کۆیان ناکاتەوە، بەڵکوو بە چەواشەکاریی لێرە و لەوێ هیچ نەما نەیکات جگە لەوەی ئیسلام بەگشتی لە هەموو ماناکانی دابڕنێت، لەدوای ئەمە هیچ شتێک نامێنێتەوە جگە لە چەند دەستەواژەیەک کە ببن بە ناونیشان بۆ چەند دێڕێکی ڕیزکراوی دابڕاو لە دروشمە باڵاکانی ئیسلام، ئەوەتا دەڵێت: "ئیسلام خودی فیترەتە و فیترەتیش ئیسلامە."(١) ئەمەش دروست و بێ کێشەیە، چونکە ئیسلام بە بیروباوەڕ و ئەحکامەکانی بێت فیترەتی خەڵکی بۆ لای خوی ڕادەکێشێت، دەبینیت لەگەڵیدا کۆکن و بانگەشەیشی بۆ دەکات بەگشتی، بەڵام ئاخۆ مەبەست و مانای ئیسلام لای شەحروور چییە؟ ئایا مەبەستی ئەوەیە کە فیترەتی دروست ئاماژەی پێداوە؟! یان ئەو ئیسلامەی کە هەرچی ئایینی جۆراوجۆرە لەخۆ بگرێت؟! وەکوو پێشتر خستمانە ڕوو لە بۆچوونەکانی شەحروور؟ ئەوەتا دەڵێت:

"جەنگ و جیهاد دژی فیترەتە، زەکاتدان دژی فیترەتە، بەڕۆژووبوون دژی فیترەتە، بەکورتی هەموو دروشمەکانی ئیسلام دژی فیترەتن."(٢)

هەموو دروشمەکانی ئیسلامی دەرهێنا، جا چی مایەوە؟

---

(١) الإسلام و الإيمان، (ص٥٣).

(٢) الإسلام والإيمان، (ص٣٧).

"پایەکانی باوەڕ کە بە ئەرک و دروشمی ئایین دانراوە لە فیترەت نییە."(١)
جا چی مایەوە لە فیترەت کە دەڵێت:"بریتییە لە ئیسلام پاش ئەوەی ناوەڕۆکی ئیسلامی هەموو سڕییەوە؟"

وەڵامی ئەمە دەداتەوە و دەڵێت: "فیترەتی مرۆڤ، وێنای لایەنە فیکرییەکە لە مرۆڤدا دەکات، واتە وێنای کۆمەڵێک دەکات کە تێیدا یاساکانی سروشت بە گوزارشتە ڕۆژئاواییەکەی."(٢)

جا شەحروور تێڕوانین و تێگەیشتنی ڕۆژئاوایی دەوێت، هەوڵی داوە کە بیروباوەڕی خۆی وەها دابڕێژێتەوە تا لەگەڵ ئەم ئەنجامەدا یەک بگرێتەوە، پاش ئەوەی وتی:"لە مرۆڤدا شتێک هەیە بەشێکە لەزاتی (الله)، هەروەها (الله) بەهۆی دروستکردنی مرۆڤەوە خۆی سەلماندووە." دەگات بە ئەنجامێک کە دەڵێت: "هەر سووکایەتییەک بە مرۆڤ سووکایەتییەکی ڕاستەوخۆیە بۆ خوا، بە بەخشینی ئازادیی خودا ڕێزی لە مرۆڤ ناوە و گەورەیی داوە بەسەر زۆرینەی دروستکراوەکانیدا."(٣)

بەمەش مرۆڤ دەکات بە ئامانجی باڵا لە خودی خۆیدا، پێشتریش «کانت»ی فەلسەفەگەر مرۆڤی کردووە بە ئامانجی باڵا بەپێچەوانەی شتەکانی ترەوە کە بە هۆکاری دانابوون(٤)، ئەمەش سەر دەکێشێت بەرەو باوەڕیی جەبریی (قەدەری ناچاریی)ەکان، بە تەسک کردنەوەی بابەتەکانی لێپێچینەوە ڕەوشتییەکان، بەڵام مرۆڤ تەنیا بریتی نییە لە چەند ڕەفتارێک کە هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر خۆیدا نەبێت، بەڵکوو بیروباوەڕ و گوفتار و کردارێشی

---

(١) الإسلام والإيمان، (ص٨٠).

(٢) الدين والحاكمية، (ص٢٥٥).

(٣) القصص القراني، (١/٢٩٢).

(٤) تأسيس ميتافيزيقيا الأخلاق، أمانويل كانت، ترجمة: عبدالغفار مكاوى، منشورات الجمل، كولونيا-ألمانيا، الطبعة الاولى: ٢٠٢٢م، (ص١٠٧).

هەیە، کە لێپێچینەوەی لەسەر دەکرێت، شەحروور جارێک بەڵگە دەهێنێتەوە بە کاروکردەوە ناشیرینەکانی تاغوتەکان بۆئەوەی بیسەلمێنیت کە قەدەر بوونی نییە و خودا زانا نییە بە وردودرشتی شتەکان، ئەوەی لەبیری خۆی بردووەتەوە کە هەردووکیان مرۆڤن (چاکەکار و خراپەکار) و کردەوەکانیان بەرز و نزمیان دەکاتەوە، ئالێرەوە ڕێچکەیەک هەیە بۆ لێپێچینەوە و لێپرسینەوەی خوایی ڕوون دەبێتەوە بۆمان.

پاشان دەوترێت: ئایا کە پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ﴾[1] دەبێتە بێڕێزی بەرانبەر خودا؟! لەبەرئەوەی قسەیەک کراوە بەرانبەر مرۆڤێک؟ یاخود بێڕێزییە بە مرۆڤێکی لاساری تاغوتی ستەمکاری تاکڕەو کە سنوورەکانی خودای بەزاندووە، ئا لێرەوە دەبینین هیچ ڕێگەیەک نەماوە تا ڕێز لەم کەسە بگیرێت.

لەبەرچاوگرتنی لایەنی مرۆڤایەتی بەتەنیا و حیساب نەکردن بۆ کردار و گوفتار و بیروباوەڕەکانی دژەوانەیە لەگەڵ قورئانی پیرۆز، ئەوەتا پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِيٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ۝٤ ثُمَّ رَدَدْنَٰهُ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ ۝٥ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ۝٦﴾[2]

واتا: «بەدڵنیاییەوە مرۆڤمان لەسەر جوانترین و گونجاوترین قامەت بەدیهێناوە، پاشان مرۆڤ خۆی لەبەر خراپەکارییەکانی چارەنووسی خۆ بۆ درۆزەخە دەبات و ئێمەش دەیخەینە درۆزەخەوە، مەگەر ئەوانەی کە باوەڕدارن و کردار و گوفتاری چاکە ئەنجام دەدەن ئا ئەوانە پاداشتی نەبڕاوەیان پێ دەبەخشین.» لە ئایەتی ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِيٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾

لە ئایەتی دواتردا ﴿ثُمَّ رَدَدْنَٰهُ أَسْفَلَ سَٰفِلِينَ﴾ واتا: «پاش ئەو جوانی

---

(١) سورة المسد، (الآية: ١).

(٢) سورة التين، (الآيات: ٤-٦).

وگەشاوەیەی کەپێمان بەخشی، سەرەنجامی بۆ ناو ئاگرە ئەگەر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودا و شوێنکەوتەی پێغەمبەران نەبێت.»[١] جا بۆیە لێرەدا لە ئایەتی دواتردا ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾ «ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کاری چاکە دەکەن.»[٢]، هەروەها باسی ڕێزلێنانی خۆی کردووە لە مرۆڤ هەروەها ڕوونی کردووەتەوە کە کردەوەکان مرۆڤ بەرز دەکەنەوە یاخود دای دەبەزێنن بۆ خواری خوارەوە؛ هەربۆیەش لەئایەتی تردا لەدەربارەی ئەوانەی کە نکۆڵی لە ڕاستییەکان دەکەن و لەبەرانبەریشیدا لووتیان بەرز بوو، دەفەرمووێت: ﴿أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ ۚ إِنْ هُمْ إِلَّا كَٱلْأَنْعَٰمِ ۖ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا﴾[٣]

واتا: «وادەزانیت زۆرینەیان دەبیستن و تێ دەگەن؟! نا بەڵکوو وەکوو ئاژەڵانن بەڵکوو ناحاڵی تریش ملی ڕێگە دەگرن.»

ئەوەتا پەروەردگار بەو فەرمایشتانە سووکایەتی پێ کردوون، دەی خۆ بڕوادارانیش ئەم ئایەتانە ڕۆژتائێوارە دەخوێننەوە، ئاخۆ شەحروور ئەمەش بە سووکایەتی کردن بە باوەڕداران بە خودا دادەنێت؟!

بەڵام لەڕاستیدا جەنابی شەحروور دەیەوێت بەبنەمای لاهوتی داهێنراوی خۆی بگات بە «لیبراڵ دیموکرات»[٤]، لەملاشەوە سەری سووڕ دەمێنیت کە زانایانی موسڵمان (پێکهاتنەوە لەگەڵ بنەماکانی شەریعەتی ئیسلام) بکەن بە مەرجی ڕازی بوون بۆ وەرگرتنی ئەو بەندانەی کە لە یاساکانی چاڕنامەی مافی مرۆڤی جیهانییەوە ڕاگەیەنران!

---

(١) تفسير القران العظيم، ابن كثير، حققه: سامي بن محمد السلامة، دار طيبة للنشر والتوزيع، الرياض-مملكة العربية السعود، الطبعة الثانية: ١٤٢٠هـ - ١٩٩٩م، (٤٣٥/٨).

(٢) تفسير القران العظيم، ابن كثير، (٤٣٥/٨).

(٣) سورة الفرقان، (الآية: ٤٤).

(٤) الدين والسلطة، (ص٤١٥).

ئەوەتا دەڵێت: "وڵاتە یەکگرتووەکان جاڕنامەیەکیان ڕاگەیاندووە بۆ پاراستنی مافی مرۆڤ لە ١٠/دیسەمبەر ١٩٤٨زایینی، سەیر لەوەدایە کە کۆنگرەکانی تایبەت بە فیقهی ئیسلامی مەرجیان داناوە بۆ وەرگرتنی جاڕنامەی مافی مرۆڤ بۆئەوەی ملکەچی بکەن بۆ یاسا و بنەما شەرعییەکان کە چەندین سەدەی پێشوو لەلایەن شەرعناسەکانەوە دانراوە."[١]

هەر خاوەن عەقڵێک بەراورد لەنێوان ماددەی ١٦ لە جاڕی جیهانی بۆ مافەکانی مرۆڤ بکات، بە نموونە کە دەڵێت: "پیاو و ئافرەت هەرکات گەیشتن بە پێگەشتن (باڵغبوون) بۆیان هەیە هاوسەرگیری بکەن خێزان پیکەوە بنێن، بەبێ هیچ مەرج و ڕێگرییەکی وەکوو جیاوازی نەژاد، و ڕەگەزنامە و ئایین."[٢] لەگەڵ قسەی پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿وَلاَ تَنْكِحُوا الْمُشْرِكَاتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ۚ وَلَأَمَةٌ مُؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِنْ مُشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ۗ وَلَا تُنْكِحُوا الْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤْمِنُوا ۚ وَلَعَبْدٌ مُؤْمِنٌ خَيْرٌ مِنْ مُشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ ۗ أُولَٰئِكَ يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ ۖ وَاللَّهُ يَدْعُو إِلَى الْجَنَّةِ وَالْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِ ۖ وَيُبَيِّنُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾[٣] بڕگەی مەبەست لەم ئایەتەپیرۆزەدا (هاوسەرگیری مەکەن لەگەڵ ئافرەتانی موشریک مەگەر باوەڕبهێنن ئەوجا هاوەسەرگیرییان لەگەڵدا بکەن) دەزانێت کە بابەتەکە ڕکەبەرایەتی نییە لەگەڵ زانایانی دێرین، بەڵکوو شەڕی شەحروور لەگەڵ خودی قورئاندایە، بەڵکوو زۆر بەئاسانی دەتوانی پەی بە ڕێڕەوی شەحروور ببەیت پاش ئەوەی شارەزای ئوسوڵی فیقهە داهێنراوەکەی دەبیت، کە خۆی لە ڕەنگدانەوەی جاڕنامەی جیهانی وێنا دەکات، بە کۆمەڵێک زاراوەی سواوی خۆی دەست بە وتە و بۆچوونەکانی دەکات، لەوانە کە دەڵێت: "قرائن، مترادفات، والسياق التاريخي والظروف،

---

(١) الدين السطة، (ص ٤١٠).

(٢) وثيقة الإعلان العالمي، من على موقع الأمم المتحدة: (http: //www.un.org.ar)

(٣) سورة البقرة (الآية: ٢٢١)

والقرائن، والصیرورة، والسیرورة، والكتاب، والقران، والمتشابهات، والمحكمات وقال فلان وفلان" بۆئەوەی هەرچ شتێک جاڕنامەی جیهانی دەیەوێت ئەم بیچڕێت و بیهۆنێتەوە، چونکە لەم جاڕنامەیەدا هاتووە دەڵێت: "لەم جاڕنامەیەدا مافی ئەوەی نەداوە هیچ بڕگەیەکی ڕاڤە و تەئویل بکرێت."[١] ئالێرەدا ملە جەڕێکانی شەحروور تەواو دەوەستێت و بانگەشەی نکۆڵی کردنی مەجاز و قیاس و تعلیل و تەفسیر دەکات، لەبەر خاترانەی جاڕنامەی جیهانی و دەڵێت:"هیچ ماناکاری و ئەملاولایەک قبوڵ ناکات و مانا و مەبەستەکەی کوت و متە، لەهەمان کاتدا لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا هەر دەیهێنیت و دەیبات و هەموو مانا و کرۆک و تەئویل و بێنە و ببەیەکی بەسەردا دەهێنیت."

خۆی مشەوش و سەرقاڵ دەکات بە هێرشی ناڕەوا بەرانبەر زانایانی ئیسلام و تۆمەتباریان دەکات بەوەی کە خۆیان کردووە بە هابەشی پەروەردگار لەپەرستراویدا، جا دەڵێت: "گەر بانگەشەی ئەوە بکەین کە فەرمایشتی خودا بەرزترینە لە پراکتیزەکردنی فیقهی بەجێماو و فەتوای زانایان و فەرمان و نەهییەکانیان و لەژێر دروشمی زۆرینەی زانایان وا ڕێککەوتوون، لەژێر دروشمی بوخاری و موسلیمدا بین، ئەمە بەڕاستی گاڵتەکردنە بە فەرمایشتی خودا، ئەمەش خۆی لەخۆیدا پەرستنی زانایانە."[٢]

بە چاوپۆشی کردن لەوەی کە ئیجماع وەکو گوتەی جمهور نییە، بەڵام شەحروور وادادەنێت کە گەڕانەوە بۆ لای ئیمامی بوخاری و موسلیم و کۆدەنگی زانایان گاڵتەکردنە بە فەرمایشتی پەروەردگار، لەکاتێکیشدا لەبارەی جاڕنامەی جیهانییەوە دەڵێت: "جاڕنامەی جیهانی بۆ مافەکانی مرۆڤ بە باشترین مانایە بۆ دروشمی (كلمة الله هى العليا) فەرمایشتی خوا بەرزترینە."[٣]

---

(١) الإعلان العالمي لحقوق الإنسان، المادة(٣٠).

(٢) الإسلام و الإيمان، (ص١٥٩).

(٣) الإسلام والأصل و الصورة، (١٩٦).

ڕێساکەی شەحروور ئەوهایە هەرچی ترش و تاڵە بۆ موسڵمانان، هەرچی خۆش و شیرینە بۆ ڕۆژئاوا، سەرەڕای چاوپۆشی کردن لەم دژیەکییە -پێشتر ئەمەمان سەلماند- ئەم ڕێسایەی لەگەڵ بانگەشەی (کلمة الله) پێویستە بەرجەستە ببێت، کە ئەمەش باوەڕێکی جەبرییە، لەولاشەوە داوانەکردن و بانگەواز نەکردنی شەحروور بۆ جێبەجێکردنی وتەکانی خودا، بەڵکوو جاڕی ئەوەش لێدەدات کە ئەوەی جاڕی جیهانی بانگەشەی بۆ کردووە کوت و مت جێ بەجێ بکرێت. ئەوەتا دەڵێت: "وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەناوەڕاستی سەدەی بیستدا جاڕنامەی پاراستنی مافەکانی مرۆڤیان ڕاگەیاند، جا ئەم پێوەرانە پێکهێنەرەی بڕبڕەی پشتی بیروباوەڕی ئیسلامی پیک دەهێنن."[١]

دەڵێت: "باشترین دەربڕین بۆ پارێزگاریی ئایین پەروەریی لە پاڵپشتی کردنی ڕێکخراوەکانی پاراستنی مافەکانی مرۆڤە کە لە لەلایەن وڵاتەیەکگرتووەکانەوە ڕاگەیەنراوە."[٢]

بەڕاستی ئەمەی شەحروور دەیکات دارنینی ئیسلامە لەهەموو ناوەڕۆکێکی، هەروەها گۆڕینی قورئانی پیرۆزە بە جاڕنامەی جیهانی، ئەی باشە تۆ بڵێی شەحروور لەگەڵ سوننەتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) چی بکات و چی بڵێت؟!

بێگومان بە زاراوەکانی «خوێندنەوەیەکی سەردەمیانەیە» و «دۆزینەوەی تازەی ئایین» بە پێی قسەکانی خۆی، یاخود (داهێنانی دینێکی تازەیە لەسەر وردکاریی و پشکنین)، شەحروور لەم بارانەوە دەڵێت: "دەتوانین بڵێین پەرلەمان شێوەیەکی تازەو سەردەمیانەی سوننەتی پێغەمبەرە بەدەرلە دروشمەکان."[٣]

ئا بەم جۆرە جاڕنامەی جیهانی بە وتەی بەرزی خوا دەزانێت و پەرلەمانی

---

(١) نحو أصول فقه جديدة للفقه الإسلامي، (ص ٣٨١).

(٢) تجفيف منابع الإرهاب، (ص ٣٠١).

(٣) الإسلام و الإيمان، (ص١١).

ولاتان بە سوننەتی پەیامبەر دادەنێت، بەلام ئاخۆ هەموو پەرلەمانی ولاتە جیاوازەکان، ولاتە دژیەکەکان، ولاتانی هەمە چەشن، هەمووی هەر وێنایەکن لە سوننە؟

شەحروور دەلێت:

"هەموو پەرلەمانەکانی جیهان لەبازنەی شەریعەتی خوداییدا دەسورێنەوە."[1]

بەم شێوەیە پەرلەمانەکان وەها وێنا دەکات کە پێچەوانەی حوکمی خودایی ناکەن، جا ئەگەر هەر بڕیارێکیش دابڕێژن، تەنانەت (کەنسیت = پەرلەمانی ئیسرائیلی) لەساڵی ١٩٨٠زاینی یاسای قودسی دانا کە قودس بە پایتەختی ئسرائیل دادەنێت، ئاخۆ ئەمەش هەر لەبازنەی شەرعی خودا دەسورێنەوە؟! بەلام لەولاشەوە ئەگەر کەسێک بگەڕێتەوە بۆ خزمەتی ئیمامی بوخاری و موسلیم بەهاوبەشی خودا دەکات لەپەرستندا لە دیدی شەحروورەوە.

لای شەحروور گەڕانەوەی حوکمەکان بۆ لای پەڕتووکەکانی سوننەت درۆی تێدایە بەناوی خواوە، بەلام (کۆمەلگەی زانستی و پەرلەمانەکان بریتین لە تێگەیشتنی سەردەمیانە بۆ سوننەتی پێغەمبەر نەوەک کۆڕگەی فەتوا و زانایانی موسلمان.)[2]

پاشانیش پێوستە هەموان ژێرباری بەشداریکردنن لە ئەنجومەنی پەرلەمانی، هیچ جیاوازییەک تێیدا لەسەر بنەمای ئایینی ناکرێت، لەسەر ئەم بنەمایەش شەحروور دەلێت: "هەرچی ولاتانی ئیسلامیشە پێویستە ئەوە بە ئاسایی وەربگرن کە مولحیدیش مرۆڤە و مافەکانی پارێزراوە، سەلامەتی فەراهەم کراوە،

---

(١) الإسلام والأصل والصورة، (ص٨٦).

(٢) الإسلام الأصل والصورة، (ص٢٢٧).

بۆچوونی خۆی هەیە و ئازادانە دەریدەبڕێت بە پێی ڕێوشوێنی خۆی بەوپەڕی سەلامەتی و وتارەکانی بەڕووی کۆمەڵگەشدا کراوەیە و بێ پەستانە، بەڵکوو ڕۆڵی خۆی دەگێڕێت لە دامەزراندنی بڕیارە دیموکراتییەکاندا."[١] بەم پێیەش بێت دەکرێت مولحید ببێتە سەرۆکی وڵاتێکی موسڵمان، یان مولحیدەکان ببنە زۆرینەی پەرلەمان، تەنانەت بەم شێوەش بێت و هەرچی بڕیاریش دەربکەن هێشتا بەلای شەحروورەوە لە سنووری چوارچێوەی شەرع دەرنەچوونە، سەیر ئەوەیە لای شەحروور پەسەند نییە و نابێ کەسێک بگەڕێتەوە بۆ قورئانی پیرۆز و سوننەتی پاک و زانایان و ئوسوڵی فیقهی بۆ تێگەیشتن لە دەقەکانی ئیسلامی مەزن، لەمانەش سەیرتر کار گەیشتووە بەوەی بڵێت: "دیموکراتی بنچینەی بنەماکانی بیروباوەڕی ئیسلامییە."[٢] کەچی لەولاوە جیاوازتر نکۆڵی ئەوەی دەکرد کە خوای پەروەردگار زانایە بە ورد و درشتی بوونەوەر و کرادرەکانی مرۆڤ پێش ڕودانیان!

بەهەرحاڵ، سەرباری چاوپۆشی لەسەر نکۆڵییەکانی سوقرات بۆ دەنگدانی دیموکراتی بەو پێیەی کە هێرشی ڕەخنەی دەکاتە سەر ئەفلاتۆنی تەلەبەی کە دیموکراتی تەنیا ئامرازێکە بۆ حکومڕانی، جا لەوانەیە شەحروور بەم قسانەی سوقراتیش بڵێت: ئەمە خوێندنەوەیەکی کۆنە، چونکە ئەم کابرایە بۆ هەمووشتێک خویندنەوەی نویی دەویت، لیرەدا پێی دەوتریت: ئەم کابرایە کە بانگەشەی خویندنەوەی سەردەمیانە دەکات هیچ وانەیەک لە پەڕتووکی (دروس فی القرن العشرین) فێر نەبووە کە تییدا هاتووە: (نابێ ئەوەمان بیر بچێت کە هیتلەر بە ڕێگەیەکی شەرعی چووەتە سەر حوکم، ئەو یاسایەش کە هەموو دەسەڵاتێکی پێ بەخشی بە زۆرینەی دەنگ لە دانیشتنی پەرلەماندا

---

(١) الدولة والمجتمع، (ص ٢٦٦).

(٢) الدولة والمجتمع، (ص٣٧١).

پەسەند كرا)[١]. ئەوجا بە بانگەشەكانی سەرنجی ملیۆنان كرێكاری بەلای خۆیدا كەمەند كێش كرد و بەڵێنی نەهێشتنی بێكاری و سەرشۆڕی پێدان، بەڵام بە ڕێگەی تایبەتی خۆی بێكاریی قەڵاچۆكرد و بە دامەزراندنی كرێكارەكان لە دامەزراوەكانی چەك بۆ پڕچەك كردنی وڵات، پاشان كردنی بە سەربازی چەك بەشان و دانی بە تەنگەی شەڕ و لە كۆتاییدا بە كۆمەڵێ لاشەی خامۆش كۆتایی پێهێنان.)[٢]

ئەم پیاوەی كە بە ناشرینی زانی كە خودا زانایە بە كردەوەكانی هیتلەر پێش ئەوەی بە ئەنجامی بگەیەنێت، نكۆڵیی كرد لەوەی خودا شتێكی وای نووسی بێت. بە هۆی دزێوێی جەنگەكەوە، بێئاگایە لەوەی سوننەتی سەردەمییانە -وەك خۆی دەڵێت- هیتلەری هێنایە كایەوە، ئەو پەرلەمانەشی -وەك خۆی دەڵێت- كە گەڕێكی بە نێو ئاسمانی شەریعەتی خوداییدا كردووە، هەر ئەوە نازییەكانی گەیاند بە دەسەڵات. دەی ئیتر چ درۆ هەڵبەستنێك لەمە گەورەترە؟

یەكێك لە گرنگترین وانەكانی سەدەی بیستەم كە «كارڵ پۆپەر»كە پوختی دەكاتەوە و دەڵێت:

(ئەوەی بە توندی بەرپەرچی دەدەمەوە لە بیردۆزی فەرمانڕەوایی گەل، ئەوەیە ئایدۆلۆجیایەكی ناژیرانە و فێڵبازانە پەسەند دەكات: فێڵبازییەكی خۆسەپێن، ڕێژەیی؛ كە گەل یان زۆرینە ناكرێت هەڵە بكەن یاخود ڕێگەیەكی نادادپەروەرانە بگرنە بەر. ئەم ئایدۆلۆجیایە بێڕەوشتییە و دەبێت ڕەتبكرێتەوە[٣]. نابێت بیرمان بچێت كە (قێزەونترین تاوانەكان ڕەنگە بە ناوی برایەتی و یەكسانی

---

(١) دروس في القرن العشرين، كارل بوبر، ترجمة: الزوزاوي بغورة، لخضر مذبوح، الدار العربية ناشرون - لبنان، منشورات الإختلاف - الجزائر، الطبعة الأولى: ١٣٢٩ هـ ٢٠٠٩ م، (ص١٠٦).

(٢) أصول الأصوليات و التعصبات السلفية، روجيه جارودى، مكتبة الشروق، يناير ١٩٦٦م، (ص٥١).

(٣) دروس في القرن العشرين، (ص١١٠).

و ئازادییەوە بکرێت؛ تاوانگەلێک لە قێزونیدا هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ ئەو تاوانانەی کە بەناوی مەسیحییەتەوە کرا لە سەردەمی خاچپەرستەکان.)[١]

بەڵام ئەم کەسە گوێ بەهەموو ئەمانە نادات، ئەوەی گرنگە چی دەرخ کردووە و بیناخنێتە ڕستەکانی پەڕتووکەکانییەوە، پاشان بە پێچوپەنایەکەوە دەیلێکێنێت بە ئیسلامەوە و دەڵێت، خوێندنەوەیەکی نوێیە! ئەمە کتومت دۆگمایەتییە، وەک بڵێیت وێژەوانی فەرەنسی «مارسیل پرۆست» پەسنی دۆخی شەحروور بکات کاتێک دەڵێت: "ڕووداوەکان ناچێتە ئەو جیهانەی بیروباوەڕمانی تێدا دەژی، چونکە کاری لەسەر لەدایکبوونیان نەکردووە و ناشی ڕمێنێت؛ دەشتوانرێت بە بەردەوامی بە درۆ بخرێتەوە بەبێ ئەوەی لاوازی بکات."[٢]

ئەم پیاوەی کە لەلایەک بانگەشەی ئەوە دەکات کۆمەڵگەکان و پەرلەمانەکان شێوازی سەردەمییانەی سوننەتی نەبەوێن، لەولاشەوە دەرفەت دەدۆزێتەوە بۆ باسکردنی ستەمی کۆمەڵایەتی[٣]، بڵێی بە چ پێوەرێک قسە لەسەر ستەم بکات لەکاتێکدا کۆمەڵگەکان خۆیان بەپێوەر دادەنێت؛ بەڵکوو بە خودی سوننەت، بەڵکوو لەسۆنگەیانەوە یاساکان دادەڕێژێت،لەهەموویشی زیاتر تیوەرەکانی چەمکی دادپەروەرین!

هەروەها بە تەواوی ئەو قەیرانە پشگوێ دەخات کە لە دادگایکردنی سەرکردە نازییە دیلەکراوەکانی نۆرێنبێرگ کە لە ناوەڕاستی سەدەی بیست سەری هەڵدا؛ لەو دادگایکردنانەدا پرسیارێک هاتە ئاراوە: چۆن لێپێچینەوە لەو دادوەرانە دەکرێت کە لە سایەیی دەسەڵاتی نازیی بوون، لەکاتێکدا دادوەر تەنیا

---

(١) بحثا عن عالم أفضل، (ص١٧٩).

(٢) البحث عن الزمن المفقود: جانب منازل السلوان، مارسيل بروست، ترجمة: إلياس بدوي، دار شرقيات للنشر والتوزيع، القاهرة، الطبعة الثانية: ١٩٩٥م (١٨٣/١).

(٣) الإسلام والإنسان، (ص١٣٨).

یاسا پەسەندکراوەکانی ئەنجومەنی یاسایی جێبەجێ کردووە، ئەی مەگەر پەراکتیزەکردنی خودی یاسا دادپەروەرەکە نییە؟! ئیتر بۆ دادوەرەکان ڕاپێچی دادگا بکرێنەوە؟!

گەر یاسادانان مافێکی کۆمەڵگە بێت، و کاری دادوەرەکانیش تەنیا جێبەجێکردنی ئەو یاسایانە بێت کە ئەنجومەنی یاسادانان دەری دەکات؛ ئەمە واتای داماڵینی دادوەرەکانە لە هەموو بەرپرسیارێتییەکی ڕەوشتی و یاسایی کە ئەو یاسایانەیان جێبەجێ کردووە کە ئەنجومەنی یاسادانان دایانناوە؛ ئیدی با یاساکەش نادادپەروەرانە و ستەمکارانە و ڕەزگەپەرستانە بێت.

کاتێکیش یاساکان زمان حاڵی ویستی گەل بێت، هەرکات ئەو یاسایە بە تاوانکارانە دانرا، ئەوکات هەموو گەل لەگەڵی تاوانبار دەبن، چونکە بە ناوی هەموو گەلەوە دەرچووە! بێمانا دەبێت گەر دادگایی سەرکردەکان بکرێت و واز لەگەل بهێنرێت؛ خۆ ئەگەر گەلێکیش بەتەواوی تۆمەتبار بکرێت، ئەمەی لەکوێی دادپەروەریدایە؟! ئیدی ئەمە هەر ڕەگەزپەرستی نییە لە بەرگی نازییەتدا دەجووڵێتەوە؟! جا شەحروور هەموو ئەمانە وەلادەنێت و پاشان بانگەشەی ئەوە دەکات خوێندنەوەیەکی سەردەمییانە دەکات!

هەر شەحروور بە تەنیا نییە کە هەوڵی نزیک کردنەوەی ئیسلام و عالەمانییەتی داوە؛ ئەوەتانێ «سادق جەلال ئەلعەزم» پەرتووکێکی نووسیوە لەسەر ئەم باسە، هەرچەندە ئەو دۆستی عالەمانییەتە وەلێ زۆر وردتر لەسەر ئەم باسە دواوە، لە قسەکانیدا ئەو درۆهەڵبستنە ڕقاوییانە نابینیت کە لە پەرتووکەکانی شەحرووردا خۆیان حەشارداوە.

کاتێک «ئەلعەزم» باسی چەمکانێکی وەک دیموکراسی، کۆمەڵگەی مەدەنی و جیاکردنەوەی ئایین لە وڵات؛ ئەو ڕاستییە مێژووییەکانی نەشێواندووە

کە ئەمانە (زادەی کۆمەڵگەی ئەوروپین)[1]، نەک شەرحرور ئاسا بکات وەک ئەوەی لەگەڵ منداڵدا دەدوێت و دەیەوێت مێشکیان بشواتەوە کاتێکدەڵێت: "ئەورووپا پاش ماوەیەکی زۆر لە مردنی پێغەمبەر وەکوو سەرمەقشی خۆیان لێی دەڕوانن."[2]

ئەلعەزم دەڵێت: "تاکە وەڵامی ورد و بەجێ بۆ پرسیاری: ئایە ئیسلام لەگەڵ بۆچوونی مرۆڤدۆستیی عالەمانییەت و پێکهاتەکانی دەگونجێت؟ ئەوەیە بڵێین: ئەم دووانە پشتیان لە یەک هەڵکردووە گەر بە دیدگای بیروباوەڕێکی وشکەوە لێی بڕوانین."[3]

هەرچەندە لایەنی بیروباوەڕ و بەهاکانەوە، بە دڵنیاییەوە ناتوانین بڵێین ئەمە ئیسلامە، بەڵام سەرباری ئەوەش ئەلعەزم دەیەوێت نزیککردنەوەیەک لەنێوان ئیسلام و عالەمانییەتدا بکات؛ هەربۆیە پێشنیازی چەند گونجاندێکی مێژوویی دەکات لەگەڵ داننانی بەوەی بیروباوەڕەکان یارمەتی نادەن لەمەدا.[4]

گرنگترین ئەو هەموارکردنەوانە:

١- (پێویستە هەموو تاقمە ئیسلامییەکان کە سەرجەم ڕێسا و بنەماکانی شەریعەت هەڵبوەشێننەوە کە تایبەتن بە حوکمەکانی (خاوەن پەیمانەکان-اهل الذمة))[5].

٢- (پێویستە هەموو تاقمە ئیسلامییەکان بە یەکجاری و بۆ هەتاهەتایە قانوونی کۆنی سزادانی ئیسلامی هەڵبوەشێننەوە کە ڕەوایی دەدات بە سزاکانی

---

(١) الإسلام والنزعة الإنسانية العلمانية، صادق جلال العظم، ترجمة: فالح عبدالجبار، دار المدى للثقافة والنشر، دمشق- بيروت، الطبعة الأولى: ٢٠٠٧م (ص٥).

(٢) السنة الرسولية، (ص٢٠٢).

(٣) الإسلام والنزعة الإنسانية العلمانية، (ص١٣).

(٤) الإسلام والنزعة الإنسانية العلمانية، (١٤).

(٥) الإسلام والنزعة الإنسانية العلمانية، (ص٢٣).

داركاری، بەردبارانكردن تا مردن و دەستبڕین و ... لەگەڵ ئەو سزایانەی كە جەستەیین.)[١]

٣- (پاشگەزبوونەوە لە كافركردنی ناموسڵمانەكان و دابەشكردنی وڵاتەكان بۆ دارولئیسلام و دارولكوفر.)[٢]

لەكۆیدا ئەلعەزم وەستا و هەر لەوێشەوە شەحروور دەست پێ دەكات، بەڵام بە ڕێگەیەكی نازانستی؛ هەموو ئەو دەستاكاریكردنانەی ئەلعەزم دەیڵێت، ئەمیش لەسەری دەدوێت تا ئاستی فرەوێژی، پاشان دەگات بە هەمان ئەنجام بەڵام بە جیاوازیی ئەوەی شەحروور بانگەشەی ئەوە دەكات خۆی بە ڕێگەیەكی نوێ هەڵیگۆزیوە كە بریتییە لە خوێندنەوەیەكی سەردەمییانە و بنەما نوێیە وردەكانی! نەك هەنگاوەكانی هەمواركردنەوەی ئایین بێت لەگەڵ عالەمانییەت!

بۆیە شەحروور وای دەبینێت كە:

١- (ڕێساكانی جەنگ و ئاشتی كە ئەو دەمە باوبوو، وەك سوورەتی تەوبە و ئایەتی سەرانە ... نووسراوگەلێكی مێژووین و مۆركی هەردەمی، پەتێتی و سیفەتی تەشریع لەخۆ ناگرێت، بەڵكوو و تەنیا بۆ پەندووەرگرتن بەكار دێت.)[٣] پاش ئەمەش پێویستە ڕێساكانی خاوەن پەیمانەكان بەتەواوەتی بگۆڕێت.

٢- (شەریعەتی ئیسلامی كە لە پەیامی موحەممەددیدا هاتووە، شەریعەتێكی سنووردانەرە (بیردۆزی سنوورەكان)، نەك توندڕەوێتی؛ بڕینی دەستی دز بەنموونە، واتە دەستگرتنەوەو دابڕینی دز لە كۆمەڵگە بەزیندانیكردنی، یان زیندانی هەتاهەتایی وەك ئەو پەڕی سنووری حكومدانەكە.)[٤] بەمەش

---

(١) الإسلام والنزعة الإنسانية العلمانية، (ص٢٣).

(٢) الإسلام والنزعة الإنسانية العلمانية، (ص٢٣).

(٣) السنة الرسولية، (ص١١).

(٤) الدين والسلطة، (ص٤٥٨).

ڕێکاری یاساکانی باری سزادانی ئیسلام دەگۆڕدرێت.

٣- بەڵام پەسنکردنی جگە ئیسلام بە کوفر، ئەمەیان شەحروور بەتەواوی پشتی تێ دەکات، بۆیە دەڵێت: "هیچ کەسێک مافی ئەوەی نییە بڕیار هاوبەش پەیداکەری (شیرک) یان کافرێتی بەسەر کەسێکدا بدا، مەگەر خۆی دانی پێدا بنێت."[١] ئەمانەی دەیڵێت ئەو پلارانە ناگرێتەوە کە خۆی دەیگرێتە فەقیهەکان بە درۆهەڵبەستن بۆ خودا و هاوبەشێتیکردنی خودا لە خوایەتیدا، ئەوەی بەلای شەحرووڕەوە گرنگە تەنیا سەلامەتی دین و میلەتانی دیکەیە.

---

(١) الإسلام والإنسان، (ص١٦٨).

## ئەرستۆگەریی...

شەحروور لەبەر لەدەستدانی هەموو بنەما و ڕێسایەک، دەرگای لەخۆی بۆ هەموو تەرزە جیاوازەکان والاکردووە، گەرچی هەندێ لەو تەرزانەی لێی دواوە تازەبن، بەڵام ئەمە دەرگای تەرزە کۆنەکانی لێ داناخات و لەسەر ئەوانیش قسان دەکات، ئیسلامیش تەنیا چەڵاگەیەکە بۆئەوەی هەر سیستەم و خوێندنەوەیەکی ویستی پێیدا هەڵبواسێت، هیچ گرنگ نییە بەلایەوە کە مێژوو و پێکهاتەی بابەتەکانیان جیاواز بێت، بەڵکوو بگاتە ئەوەیش کە هەر دژی ئیسلامیش بێت، شەحروور تێکهەڵکێشیان دەکات بەناوی خوێندنەوەی تازەوە و هیچ باکیشی نیە.

یەکێک لەو سیستمانە ئەرستۆییە یان (ئەرستۆگەرایی)، دەیبەستێتەوە بە ئایەتەکانەوە و دەرەنجامیان بۆ دەردەهێنێت، جا نموونەیەک لەوانەش ئەو دەرەنجامەیە بۆ بابەتی پەیامبەر ئیبراهیم (علیه سلام) دایدەنێت کە ناوی ناوە دەرەنجامە زۆر گرنگەکان:

(پەروەردگار نابینرێت و نابیسترێت و دەستی بەرناکەوێت، کەواتە ناتوانرێت دەربخرێت و دیاری بکرێت. هەموو شتێک لەم گەردوونەدا دەگۆڕێت و دەجووڵێت بەپێی پەرەسەندن، بەڵام تەنیا پەروەردگار نەگۆڕە.)[1]

لە بابەتی ئەوەی دەڵێت کە (الله) نابینریت و نابیسترێت هاوڕای گرۆیی جەهمییەکانە، کە زانایانمان زۆر بە چڕوپڕیی وەڵامی داونەتەوە، لەملاشەوە ئەم بۆچوونانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەرستۆ و پێش ئەویش لای ئەفلاتۆن، جا ئەم

---

(١) الإسلام والإيمان.

کابرایە کە بانگەشەی ئەوەدەکات دژی نموونەیی بوونە کەچی خۆی تێیدا بەتەواوەتی ڕۆدەچێت، چونکە ئەوەی لێی دەدوێت کە نابینرێت و نابیسترێت و ناتوانرێت دیاری بکرێت و هیچ بوونێکی نییە، تەنیا بیرۆکەیەکی عەقلییە کە بانگەشەی بۆ دەکات گوایە بوونێکی واقعی و بەرجەستەیە، چونکە (لە تایبەتمەندییەکانی نموونەیی بوون: گۆڕانی بەرهەمەکانی پوختەبوونی (وێناکان-بۆچوونەکان)ە بۆ ناوەڕۆکی بوون و سەرەتایی بەدیهاتنی شتەکە)[1]، بەم پێیەش ئەوەی کە دەیداتە پاڵ پەیامبەر ئیبراهیم (علیە سلام) درۆیەکی ڕەهایە کە لەسەر هیچ جۆرە بەڵگەیەک ناوەستێتەوە.

بەڵام ئەو وتەی کە دەڵێت گوایە ئیبراهیم (علیە سلام) گەیشتووەبەوەی کە هەموو شتەکان گۆڕانیان بەسەردا دێت جگە لە پەروەرگار، ئەمەش تەنیا دووبارەکردنەوەی وتەکانی ئەرەستۆیە کە دەیگوت ئەو جووڵاوەی کە ناجووڵێتەوە، جا جووڵە بەلای ئەرستۆوە بریتییە لە بچکووترین گۆڕان، نەک گۆڕانی شوێن، ئەم دیدگایەش هی پێش ئەرستۆیە، ئەوەتا «زینۆفانیس» پێش ٢٥٠٠ ساڵ وێنای خواوەندی کردووە بەوەی کە (هەرگیز جووڵە ناکات و هیچ شایستە نییە کە لەوێ بۆ ئەوێی تر بڕوات.)[2] دواتر ئەرستۆ هات و ئەوەی پەسەند کرد و هەندێک پەرەی پێدا، بەڵام ئەو دەمەی کە زۆرێک لە وتارەکانی ئەرستۆ وەرگێردرا بۆ زمانی عەرەبی دەربڕینی (لام)ێک بۆ ڕستەکەی ئەرستۆ زیادکرا و بڕگەکە بووبە(المتحرک الذی لا یتحرک): "ئەو جووڵاوەی کە هەرگیز ناجووڵێت."، ئەبو بیشر مەتا گێڕاویەتییەوە لەڕاڤەی ناوی (الأسکندر) ئەسکەندەر بۆسەر زمانی عەرەبی، ئابەم شێوەیەش وەرگێڕانی ڕاڤەی ثامستیۆس بە پایان گەشت.[3]

---

(١) الموسوعة الفلسفية، بإشراف: روزنتال، يودين، (ص١١٢).

(٢) بحثا عن عالم أفضل، (ص٢٣٥).

(٣) الفهريت، محمد بن إسحق النديم، دار المعريفة، بيروت - لبنان، (ص٣٥٢).

ئا لێرەوە گرووپی گومڕایی جەهمییە، بەدیاریکراوی بیشری مەریسی -یەکێکە لە ناودارانی جەهمییەکان- لە ڕاڤەی ناوی پەروەردگار (القيوم) دا گوتی: "ئەوەیە کە هەمیشە لە جێگەی خۆیدایە و هەرگیز ناجووڵێت."[1] ئەوەبوو پێشەوا عوسمانی دارمی بەرپەرچی دایەوە و لەڕوویدا وەستایەوە بەو وتەی کەفەرمووی: "هەموو زیندوویەک دەجووڵێتەوە و هەموو نەجووڵاوێکیش مردووە و ئەستەمە وانەبێت."[2]

بەردەوام بۆچوونەکانی ئەرستۆ کاریگەریی لەسەر گرووپەکان دروست کردبوو، هەمووان بەراورد و هەوڵی ڕاڤە و نزیککردنەوەی ماناکانیان بە بەڵگەی پەیامبەر ئیبراهیم (علیه سلام) دەهێنایەوە کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، لێرەوە ئیبن سینا لە کاتی ڕاڤەی وتەی پەیامبەر ئیبراهیم (علیه سلام) لەو ئایەتی کە دەفەرمووێت: ﴿فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلۡأٓفِلِينَ﴾[3] وتی:"ئەگەری ئیمکانی هەر داچوونێک بۆ شتەکان بریتییە لە ئاوابوون."[4] دەبینین ئاوابوونی لەسەر مانا و مەبەستە فەلسەفییەکان کرد کە ئیمکانە نەک حەتمییەتی بوون (الواجب الوجود).

بەڵکوو ئەم نزیک خستنەوەیە بە ڕێگەی بەڵگەکانی پەیامبەر ئیبراهیمەوە (علیه سلام) بەردەوام لە زیادبووندابوو هەتا گەیشتن بە تەواوی وتەکانی ئەرستۆ بە ڕەهایی، لەو وتانەش دەڵێن: "جالەبارەی ئیبراهیمی خەلیلەوە (علیه سلام) کە خوای گەورە بەسەرهاتەکەی لە قورئاندا هێناوە: بەوەی کە ئیبراهیم (علیه سلام) بوونی گۆڕانی بەسەر حاڵی هەسارەکاندا کرد بە بەڵگەی

---

(١) رد الدارمي عثمان بن سعيد على بشر المريسي العنيد، (ص٢٠).

(٢) رد الدارمي عثمان بن سعيد على بشر المريسي العنيد، (ص٢٠).

(٣) سورة الأنعام، الآية (٧٦).

(٤) الإشارات والتنبيهات، (١٠٣/٣).

بۆئەوەی کە ئەمانە خوا نین و بەدیهێنراون."[١]

ئەو وتانەی کە شەیخی ئیسلام ئیبن تەیمیە بەرپەرچی دەداتەوە و دەفەرمووێت: "ئەم لێکدانەوەیە پێچەوانەی ڕای هەموو زانایانی زمان و تەفسیرە، بەڵکوو پێچەوانەی زانستی زۆر سادەی بەدیهیەکانی ئایین و گێڕانەوەی موتەواتیر لە زمان و تەفسیرە، چونکە وشەی (الافول = ئاوابوون) بریتییە لە دیارنەمان، دەوترێت: خۆر ئاوابوو، ئاوابوو و دیارنەما لەبەر چاوان، هەرگیز هیچ کەسێک نەیگوتووە کە مانای (أفول) بریتییە لە گۆڕان، هەروەها کاتێک کە خۆر ڕەنگی دەگۆڕیت کەس ناڵێت ئەوە خۆر ئاوابوو، ئەوکاتەی کە دەجووڵێت لە ئاسماندا ناوترێت ئەوە ئاوابوو، هەروەها کاتیک با هەڵدەکات کەس ناڵێت ئەوە با ئاوابوو، یان کاتێک ئاو لە ڕێڕەوەکەیدا دەڕوات کەس ناڵێت ئاوادەبێت، بۆ درەختیش کاتێک دەجووڵێتەوە کەس ناڵێت ئاوابوو، بەهەمان شێوە کاتێک مرۆڤەکان دەجووڵێن ودەدوێن وکاردەکەن کەس پێیان ناڵێت ئاوابوون، بەڵکوو تەنانەت کەس هەرگیز نەیوتووە هەرکەسێک نەخۆش بێت یان زەردیان سوور هەڵگەڕێت ئەوە ئاوابووە!

بەڕاستی ئەمە گەورەترین درۆیە کە داتاشرابێت بۆ پەیامبەر ئیبراهیم (علیە سلام) و پەروەردگار و پەڕتووکی پیرۆزی قورئان و پەیامبەری ئیسلام (ﷺ) کە پەیامی خوایی گەیاند و نێردراوەبۆ خەڵکی و بۆ هەموو میللەتی موسڵمان، وە هەموو زانایانی زمان و هەموو ئەوانەش کە شارەزان لە مانا و مەبەستەکانی قورئانی پیرۆز."[٢]

بەڕاستی: (کاتێک باسی بەڵگەکانی قورئانی پیرۆز دەکرێت، پێویستە

---

(١) أساس التقديس، محمد بن عمر الرازي، تحقيق: أحمد حجازي السفا، مكتبة الكليات الأزهرية، (ص٣٥).

(٢) مجوع الفتاوى، (٢٨٤/٦، ٢٨٥).

شارەزایی هەبێت لە بنەماکانی زمانی عەرەبی و بەو شێوە و مانایەی کە پێی دابەزیوە، بەڵکوو هەندێک جار تەنیا بە زمانی قورەیش دابەزیوە، کەس مافی ئەوەی نییە کە وەریچەرخێنێت بۆ مانای جیاواز لە مانا زانراوە گشتییەکەی یان زاراوەی تایبەت، بەڵکوو تەنیا لەسەر هەمان زمان و زاراوەی سەرەتا لێکدەدرێتەوە.)[١]

بەڵام ئەم کابرا بێ شەرمە (شەحروور) گوێ بە هیچ نادات، جارێک ملهوڕی دەکات لەوەی کە بگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتنی ئیسلام بە پێی سەردەمی پەیامبەر (ﷺ)، بۆئەوەی لەوێوە بپەڕێتەوە بۆ عالمانییەتی ئەورووپایی، جارێکیش وەها دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتنەکانی پێشوو سەری لە سەردەمی پێش مێژووی زاینییەوە دەردەچێت — سەردەمی ئەرستۆ و پێش ئەویش- بۆئەوەی ڕاڤەی قورئانیان پێ بکات، بەبێ ئەوەی لەسەر ڕێسا و ئوسوڵەکانی خۆی پێ چەسپاوانە بڕوات.

ئەمە ئەو کابرایەیە کە دەیگوت: "ئێمە بە ڕوانگەیەکی سەردەمیانەوە لە قورئانی دابەزێنراو دەڕوانین؟"[٢] هەر خۆیەتی کە دەڵێت: "ئیبراهیم (علیه سلام) هیدایەتی دۆزییەوە، لەمیانەی گەشتێکی دووورودرێژ ... خوای تاک و تەنیای بێ گۆڕانی ناسی ... بۆیشی دەرکەوت کە گەردوون بەهەموو پێکهاتەکانییەوە دەجووڵێتەوە."[٣] ئاخر ئەمە چ سەردەمیی بونێکە؟ چونکە خواوەند لای ئەرستۆ ئەسڵەن بەدیهێنەر نییە، چونکە ناجووڵێت، کەواش بێت ئەو خواوەندە بە هیچ سیفەتێک لە سیفاتە کردارییەکان وەسف ناکرێت، بەڵکوو جووڵاندنی شتەکانیش دەسەڵاتی ئەوی تێدا نییە، بەڵکوو جووڵان و ڕۆیشتنی

---

(١) بيان تلبيس الجهمية في تأسيس بدعهم الكلامية، أحمد ابن تيمية، مجمع ملك فهد لطباعة المصحف لشريف، ١٤٢٦ هـ (١٩٢/٣)، بإختصار يسير.

(٢) الإسلام والإيمان، (ص٢١).

(٣) القصص القراني، (١٠٩/٢).

بەدیهێنراوەکان بۆ لای خوا وەکوو کاردانەوەکانی عاشقێکە بۆ مەعشوقەکەی بەبێ هیچ جوولەیەکی مەعشوق، پاشانیش ئەم خواوەندە بە پەردەی ئایینی بۆشرێت هەرزوو مەحکوم دەکرێت و شکست دەهێنێت، جا بۆنا! لە کاتێکدا لە سەردەمانێکدا بەهۆی «تۆما کوینی»ەوە بۆماوەیەکی دوورودرێژ لە کونجی کڵێسەکاندا ماوەتەوە، ئەوەتا تۆما دەڵێت: "ئەوە زۆر ڕوونە کە (الله) بەهیچ شێوەیەک نابێت جوولەی هەبێت."(١) ئەوەبوو هەرزوو پێنووسی ڕەخنەگرانی لەخۆی وروژان، کە لێرەدا پێویست ناکات باسی بکەین.

«ڕوجیە جارودی» لە پەسنی دیدگای ئەرستۆ بۆ مانای خودادا دەڵێت:

"ئەو خواوەندەی «ئەرستاتالیس» باسی دەکات پیرە، جوولاوی جێگیر، پەروەردگارێکی ساردی مردووە، وا گومان دەبەم پیرییەکی وەها بەسەریدا هاتبێت بەرەو مردنی بردبێت."(٢) ئاخۆ چی گوتبا ئەگەر بێتوو قسەکانی کابرای (خوێندنەوەی سەردەمیانە = شەحڕوور)ی خوێندبایەتەوە؟ کە هیچ شتێکی تازەی نەگووت جگە لە سووڕانەوە بەدەوری خولگەی خواوەندەکەی ئەرستۆ دا؟!

---

(١) الخلاصة اللاهوتية، توما الأكويني، ترجمەمن اللاتينية إلى العربية: بولس عواد، الطبعة الأدبية، بيروت - لبنان، ١٨٨٧ م، (٩٥/١).

(٢) البديل، روجيه جارودی، ترجمە: طرايشی، دار الآداب، بيروت - لبنان، (ص٣٩).

## هەندێک بابەتی تر ...

دوای ئەوەوەی کە ئەو بنەمایانەمان خستە ڕوو بۆ خوینەری بەڕێز کە شەحروور تەرزەکانی لەسەر بوونیاد نابوو، بۆئەوەی زۆر لەسەری نەچین و خوێنەر بێزار نەکەم، دەچمە سەر چەند باس و نموونەیەکی جیا جیا بۆئەوەی توانا و شیاوێتی ئەم کابرایە لە ڕووی زانستییەوە ڕوون ببێتەوە لە زۆرێک لە بوارەکاندا.

جا ئەم کابرایە بۆئەوەی وەها پیشان بدات کە زانیاریی فراوان و خوێنەوار و خوێنەرێکی نایابە، لەخۆیەوە ناوی کۆمەڵێک پەڕتووک و پیاوانی زانست لە سەرەتای زۆرێک لە نووسین و پەڕتووکەکانیدا دەهێنێت بەچەشنێک هیچ ڕازاوەیی لە وشە و پیتەکانیدا نەماوە و کەوتووەتە نێو هەرەمەکیەکی زۆر بێتامەوە، لەوانەش:

(ئاخۆ ئێمە توانیومانە شافیعی تێپەڕێنین و هەنگاو بنێین بەرەو ئوسوولێکی تازەی فیقهی؟ ئایا تاونیمان بوخاری و موسلیم تێپەڕێنین و خۆمان بنەماگەلێک دابهێنین بۆ پاڵاوتنی سوننەت؟ ئایا توانیومانە بەڵگەکەی ئیسلام (غەزالی) تێپەڕێنین؟ ئاخۆ توانیومانە شێخی گەورە و کیبریتە سورەی زانست ئیبن عەرەبی تێپەڕێنین؟ یان زانایانی کەلامی ئەشعەریی و موعتەزلیی تێپەڕینین؟ یاخود توانیمان تەبەری و ئیبن کەسیر تێپەڕینین؟)[١]

ئەم ناو ڕێزکردن و خستنە ڕووانە تەنیا پیشاندانە و هیچی تر، ئەگینا سادەیی و بێ مانایی وتەکانی هەمیشە ئابڕووی دەبرد و بێ تواناییەکانی

---

(١) الدولة و المجتمع، (ص٢٢٨).

ئاشکرا دەکرد، چ بگات بەوەی سنگ دەربەڕێنێت بۆ ڕەخنەگرتن، لەوانەش:

تێکەڵکردنی لە ئەشعەرییدا:

شەحروور وتی: "ئەبوو موسای ئەشعەری (خودا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: کەراماتی ئەولیا حەق و ڕاستە و یەکێکە لە ڕوانگەکانی ڕاستخستنەوەی پەیامبەران و دڵنایی موعجیزات."[١]

بەڵام لە ڕاستیدا ئەم قسەیە هی ئەبوو حەسەنی ئەشعەرییە،[٢] کە لە زانایانی موتەکەلمیینە و ساڵانی سەرەتایی سەدەی چواری کۆچی مردووە، نەک ئەبوو موسای ئەشعەری (خودا لێی ڕازی بێت) بێت کە هاوەڵێکی ناوداری پەیامبەرمانە (ﷺ)، ئەم زانیارییە فێرخوازێکی زۆر سەرەتایی زانستی توراس (فەرمودە و ڕیجال) دەیزانێت!

## درۆ بەناوی شافیعییەوە (خودا لێی ڕازی بێت):

شەحروور بانگەشەی ئەوە دەکات کە ئیمامی شافیعی (خودا لێی ڕازی بێت) بەهیچ شێوەیەک بە ڕەوای نەزانیوە کەسێک قورئان بخوێنێتەوە لەناو نوێژدا جگە لە زمانی عەرەبی، لەسەر بنەمای ئەوەی کە (دەوەستێتەوە لەسەر پیرۆزی زمانی عەرەبی)،[٣] ئەمەش بۆئەوەی بڵێت: (ئەم ڕەفتارەی شافیعی (خودا لێی ڕازی بێت) بابەتی دەمارگیری و نەتەوە پەرستییە کە هیچ بنەمایەکی نییە.)[٤]

---

(١) الدولة والمجتمع، (ص٢٦١).

(٢) الملل والنحل، الشهرستاني، (ص٨٧-٨٩).

(٣) السنة الرسولية، (ص٥١).

(٤) السنة الرسولية، (ص٥٠).

ئەمانە هەمووی تەنیا تێکەڵ و پێکەڵە شەحروور کردوویەتی کە درێژەپێدەری دارشتنە بێ سەورەبەرەکانی جەنابی شەحروورە، هیچ پەیوەندییەکی بە بابەتەکەوە نییە.

چونکە ئیمامی شافیعی (خودا لێی ڕازی بێت) کاتێک کە بۆی ڕاستبوویەوە کە فەرمان کراوە سورەتی پیرۆزی فاتیحە لە نوێژدا بخوێنرێتەوە، پاشان پەیامبەرمان (ﷺ) (ڕوخصەت) مۆڵەتی فەرمووە بۆ ئەوانەی ناتوانن سورەتی فاتیحە بخوێنن و ڕەوان ببن کە تەنیا زیکری پەروەردگار بکەن بە (الحمدلله، و الله أكبر)، ئەوەتا ئیمامی شافیعی (خودا لێی ڕازی بێت) فەرموویەتی:

"فەرمانی فەرمووە کە ئەوەی ناتوانێت بەجوانی و ڕەوانی سورەتی فاتیحە بخوێنێتەوە، با (الحمدلله، و الله أكبر) بکات لە جێگەی سورەتی فاتیحەدا، ڕەوا نییە بۆ کەسێک کە خوێندنەوەی ڕەوان و باش نییە جگە لە یادەکانی خوا شتی تر بخوێنێتەوە."(١)

ئەمەش بۆ یەکێک لە بنەماکانی ئوسوڵی فیقهەکەی دەگەڕێتەوە کە (قیاس لە مۆڵەتەکان (ڕوخصەت)ەکاندا نییە)، ئەوەتا لە پەڕتووکی ڕیسالەدا دەفەرموێت: (وتی: ئەو هەواڵانە (ڕیوایەتانە) چین کە قیاسیان تێدا نییە؟

وتم: ئەو حوکمانەی کە بەڵگەیەک لای خوای پەروەردگارەوە هاتبێت و پاشان لە سوننەتی پەیامبەرەوە (ﷺ) مۆڵەتێک بۆ ئاسانکاریی درا (ئیزنی دابێت بۆ حاڵەتێک) لە هەندێ لە فەرزەکاندا، کردار بەو ئیزنە دەکرێت کە پەیامبەرمان (ﷺ) ئیزنی داوە، جیا لە شتی تر، هەروەها نابێت بکرێتە پێوەر و قیاس بۆ بابەتی تر، ئیتر بەم شێوەیە، یاخود لە سوننەتی پەیامبەردا (ﷺ)

---

(١) الأم: محمد بن إدريس الشافعي، تحقيق و تخريج: رفعت فوزي عبدالمطلب، دار الوفاء - المنصورة، الطبعة الأولى: ١٤٢٢هـ - ٢٠٠١م , (٢٣١/٢).

حوکمێکی گشتی هاتبێت، دواتر سونەتێکی تر جیاکرابێتەوە لەو حوکمە گشتییە.)[١]

بۆمان ڕوون بویەوە کە ئیزنەکە (ڕوخصەتەکە) بۆ کەسێکە کە نازانێت و ناتوانێت بەجوانی سورەتی بخوێنێتەوە، پێشەوا شافیعی (خودا لێی ڕازی بێت) مافی ئەوەی نەبووە کە قیاسی تری لەسەر بکات، چونکە بنەماکەی دەزانی، بەهەرحاڵ ئێرە شوێنی ڕوون کردنەوەی بابەتە فیقهیەکەی ئیمامی شافیعی (خودا لێی ڕازی بێت) نییە، بەڵکوو مەبەست خستنەڕووی درۆکانی شەحرووره بەناوی ئیمامی شافیعییەوە (خودا لێی ڕازی بێت)، بەڕاستی ئیمامی شافیعی (خودا لێی ڕازی بێت) جوانی فەرمووە لەبارەی کەسانێکی هاوشێوەی شەحروور کە زانست بە هەرەمەکی هەڵدەگرن:

(ئەمە وێنەی کەسی کۆکەرەوەی چیلکەیە لە شەواندا، چڵەدار و درەخت و چیلکە دەقرتێنێ، و بەبێ ترس دەستی بۆ دەبات و دەیدات بە شانیدا، بێ ئەوەی بیر بکاتەوە خۆ لەوانەیە لەنێو چیلکە دارەکاندا مارێک هەبێت و پێوەی بدات و زیرەی لێ هەڵبسێنێت و ئەمیش ئاگای لە خۆ نەبێت.)[٢] ئەمەش واتای ئەوە دەگەیەنێت کە (هەرکەسێک دەست بداتە نووسینەوەی بابەتی زانستی بەبێ ئەوەی تێیگەشتبێت.)[٣]

---

(١) الرسالة، (ص٥٤٥).

(٢) آداب الشافعي و مناقبه، عبدالرحمن ابن أبي حاتم الرازي، تحقيق: عبدالغني عبدالخالق، تقديم: محمد زاهد الكوثري، دار الكتب العلمية، بيروت - لبنان، الطبعة الأولى: ٢٠٠٣م، (ص٧٤).

(٣) آداب الشافعي و مناقبه، عبدالرحمن ابن أبي حاتم الرازي، تحقيق: عبدالغني عبدالخالق، تقديم: محمد زاهد الكوثري، دار الكتب العلمية، بيروت - لبنان، الطبعة الأولى: ٢٠٠٣م، (ص٧٤).

## نکۆڵی لە هەندێک بابەت کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە:

شەحروور نکۆڵی ڕوودانی موعجیزە ماددییەکانی پەیامبەر (ﷺ) دەکات کە لە ژیانیدا ڕوویاندا بێت، وتی: "قورئان هیچ جۆرە موعجیزەیەکی ماددی تۆمار نەکردووە کە لە ژیانی پەیامبەردا (ﷺ) ڕوویدابێت ."(١)

دەی ئەوەتا خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿سُبْحَـٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَـٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَـٰتِنَآ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾(٢)

واتا: «پاک و بێگەردی بۆ پەروەرێن کە شەو ڕەوی کرد بە بەندەکەی لە مزگەوتی حەرامەوە بۆ مزگەوتی ئەقسا، کە چواردەورمان تەنیوە بە بەرەکەت، بۆئەوەی بەشێک لە نیشانەکانی دەسەڵاتمانی پیشان بدەین، هەر ئەو خوایەیە کە بیسەر و بینەرە.»

دەی ئەوەتا شەوڕەوی پێ کردووە..

هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ﴿١﴾ وَإِن يَرَوْا۟ ءَايَةً يُعْرِضُوا۟ وَيَقُولُوا۟ سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ﴿٢﴾﴾(٣)

واتا: «هاتنی ڕۆژی دوایی نزیک بووەتەوە و مانگیش شەقیبرد (١) سەرباری ئەوەی نیشانەیەک دەبینن هێشتا هەر پشتهەڵدەکەن و دەڵێن ئەمە جادووی بەردەوامە.»

ئەوەتا ئەمیش مانگی ماددی شەقی بردووە.

---

(١) السنة الرسولية، (ص٣٩).

(٢) سورة الاسرى، (الآية: ١).

(٣) سورة القمر، (الآية: ١ و ٢).

## پیاوانی مێینە!

دوای ئەوەی بە بنەماکانی شەحروور تێگەیشتیت دەکرێت وێنای ئەنجامەکانیشی بکەیت، بەڵام سەرسوڕمان ئەوەیە کە دەیکاتە ئامرازی گەیشتن بەو ئەنجامانەی کە وتوونی، ئەوەتا بە گژی ئەم ئایەتەیا دەچێتەوە کە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡۚ﴾[١]

واتا: «پیاوان باڵادەستترن بەسەر ئافرەتاندا لەبەر فەزڵێکی خوای گەورە و لەبەر ئەوەش کە خەرجی و ئەرکی ژیانیان لەئەستۆدایە.»

ئەوە شتە سەیرە چاوەڕوانکراوەی شەحروور بیڵێت لەسەر سەرەتای ئەم ئایەتە، ئەوەیە کە بیکاتە بەڵگەی یەکسانی نێوان پیاوان و ئافرەتان، لەو نێوەندەشدا باسی «باڵادەستی و میرات»[٢]، ببینە لەڕاڤەی وشەی (الرجال)دا چی دەڵێت؟

دەڵێت: "الرجال: واتا پیاوان و ئافرەتان"[٣] بەڵام ئەمە بە بچووکترین ترازان پەیوەندی بە ئافرەتانەوە نامێنێت، جا.نازانم چۆن ڕاڤەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە دەکات:

﴿وَإِنْ كَانُوا إِخْوَةً رِجَالًا وَنِسَاءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ ۗ﴾[٤]

واتا: «خۆ ئەگەر کۆمەڵێک برا و خوشک بوون ئەوە با هەر برایەک دوو هێندەی خوشکێکی ببات.»

لای ئەم کابرایە بابەتەکان پەیوەندیی بەزمانەوانیشەوە نییە، بەڵکوو

---

(١) سورة النساء، (الآية: ٣٤).

(٢) الدرين والسلطة، (ص٤٥٦).

(٣) اللإسلام الأصل والصورة، (ص٢٣٧).

(٤) سورة النساء، الآية (١٧٦).

بەپێی داخوازی ڕێکخراوە پەنهانییەکانی پشتی (دەستی پشت بیرۆکەکانی شەحرۆور) دەجووڵێتەوە، بەڵام لەسەرخۆبە بزانین، ئەوە شەحروور نەبوو دەیگوت باشترین ڕاڤەکار بۆ بەدیهێنراوەکان جەنابی دارویینە؟

ئیتر بۆچی شەحروور خۆی ڕاڤەی ئەو ئایەتانەی دەکات کە پەیوەندیان بە پیاوان و ئافرەتانەوە هەیە کە بەشێکن لە بەدیهێنراوەکان، ئەی بۆچی ناگەڕێتەوە بۆلای داروین هەتا ببینێت ئەو چی دەڵێت، ئاخۆ داروین بۆچوونی یەکسانی پیاوان و ئافرەتان پشتگیری دەکات؟

داروین دەڵێت:

"پیاو بوێرتر و لێهاتووترە بۆ شەڕ و جەنگ، زیاتریش چالاک و بزێوە بەبەراورد لەگەڵ ئافرەتدا، بەڵکوو سەرچاوەی داهێنەرانەی زیاتری هەیە، بێگومانین لەوەشی کە قەبارەی مێشکی گەورەترێکە لە هی ئافرەت."[١]

خۆ ئێستا باشترین ڕاڤەکار بۆ ئایەتەکانی سەبارەت بە بەدیهێنراوەکان بەلای شەحرورەوە لەگەڵ خدی شەحڕووردا دژەیەک وەستاونەتەوە؟!

ئەوەتا داروین دەڵێت: "جیاکاریی زۆر ڕوون لەنیوان ئافرەت و پیاودا لە تواناکانی زەینی نێوان هەردوو ڕەگەزدا بەجوانی لە ڕێگەی گەیشتنی پیاوان بەهەر پلە و پۆستێکی بەرز لە هەموو بوارەکاندا دەردەکەوێت، ڕێژەکەی لای پیاوان زۆر زیاترە لەڕێژەی ئافرەتان، جا هەر بوارێک بێت کە پێویستی بە تێفکرانی قووڵ هەبێت، یان لێهاتوویی، یان توانای ئەندێشە، یان تەنیا پێویستی بە هەستەوەرەکان یاخود توانای دەست بێت.

خۆ ئەگەر خشتەیەک بۆ تۆماری جیاوازییەکانی نێوان پیاوان و ئافرەتان بکەین زیاتر بۆمان ڕوون دەبیتەوە کە هەر لە پرچ برین و وێنە و هونەری

---

(١) نشأة الإنسان، (١١٩/٣).

هەڵکۆڵین و مۆسیقا، لەگەڵیشیدا نووسینەوەی بابەتی مۆسیقی و وتنەوە و ژەنین و مێژوو و زانست و فەلسەفە، ئەمانە لەگەڵ نیوەی (دەرزەن) دەستەیەک[1] لەو ناوانەی کە دەچنە ژێر هەر بابەتێکیانەوە، دەی دوای ئەم بەراوردانە هیچ بوارێک بۆ ئەوەش نامێنیتەوە کە تەنانەت بەراورد بکرێت لەنێوان پیاوان و ئافرەتاندا."[2]

بەڵام چی دەڵێیت لەگەڵ هەگبەی پڕ چەواشەی شەحروور دا.

---

(١) بۆ ئەم دەربڕینەوشەی (دزينة) لە عەرەبیەکەدا هاتبوو کە(دوانزە لەهەرشتێک دەکات، وەلای خۆمان بەوشەی دەستەیان دەرزەن) ئاماژەی بۆ دەکرێت.

(٢) نشأة الإنسان، (١٣١/٣).

# کۆتایی

بینیمان کە چۆن خەڵکانێکی زۆر لە نووسەران هەرایان ناوەتەوە بەناوی مەنهەجەوە، لەکاتێکدا ئەوانەی کە دەیاننووسن کۆمەڵێک شتی زیادەن و تەنیا لە ڕووکەشی زانستن، کۆمەڵە دیرێک کە ڕێکخراوە بیانییەکان لە پشتیانەوە یاری بە دەقە شەرعییەکان دەکەن، بەڵام وەکوو بنەمایەکی زۆر پتەو مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت، و بەتەواویش ملکەچیان دەبن وەکوو بڵێی بابەتێکی یەکلاکراوە و چەسپاوبن، لەپێناو بەرژەوەندی ئەو ڕێکخراوانەشدا ملی هەموو دەقێک و ماناکانیشی خوار دەکرێتەوە، بەڵام بوەستە با هەڵوێستەیەک بکەین، ئاخۆ (سەختی ڕووت و ڕەجاڵی باشترە لە پۆشاکی شڕوشۆڕ؟[1])[2]

خۆ لانی کەم پۆشاکی شڕوشۆڕ نەنگییەکان دادەپۆشێت و تا ڕادەیەکیش جوانی دەردەخات، ئیتر بۆچی شەحروور بە ئیسلام وەکو خۆی ڕازی نیە و ڕێگەی ئاخنینی ئەو سیستەمانە بۆ ئیسلامی گرتۆتەبەر و بەناوی ئایینەوە دەوێت؟ لەپێش چاوی موسڵمانان خۆی پێ دەڕازێنێتەوە؟ ئاخۆ بۆچی ڕووڕاستانە ناڵێت بۆچوونەکانم لەسەر بیری ئەو ڕێکخراوانە بوونیاد ناوە، لە بری ئەوەی بڵێت من بۆچوونەکانم هەمووی هەڵقوولاوی قورئانە بە خوێندنەوەیەکی تازەی سەردەمییانەوە؟

---

(١) ئەم پەندەبەزۆر شێواز و زۆر مانا لێک دەدرێتەوە، نزیکترین مانا بۆ ئێرە، بەپێی دێڕەکانی دوای خۆی ئەمەبوو کەنوسیومە، پێ دەچێت کەسێک زیاتر هاوکارمان بکات بۆ مانایەکی تەواو تر.. (وەرگێڕ)، دەقی پەندەکە: (العری الفادح خیر من زي الفاضح).

(٢) الكنز المدفون والفلك المشحون، جلال الدين السيوطي، ضبطه: محيى الدين الصغير، دار الكتب العلمية، بيروت-لبنان، (ص٨٩).

ئایا ئەم ڕێگایەش هەمان ئەو ڕێگایە نیە کە فیرعەون دەیگرتە بەر، بۆ گەیشتن بە هەمان ئەنجام و دەرەنجام؟ کاتێکئەیگوت: ﴿فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ﴾[١] واتا: «من پەروەردگارە بەرز و بڵندەکەتانم.»خۆ وا دەردەخات زۆر ڕون و ڕەوان و جوان دەدوێت..! و بێ پەردە خۆی لە خوای ئەو خەڵکە دەزانێت.

هەروەها: ﴿قَالَ فِرْعَوْنُ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ﴾[٢] واتا: «فیرعەون گوتی: هیچ شتێکتان پیشان نادەم جگە لەبۆچوونی خۆم، وە جگە لە ڕێگەی ڕێنمایی و تێگەیشتن ڕێگەیەکی ترتان پیشان نادەم.»

بەڵام شەحروور لەجیاتی ئەوەی بە کورتی و پوختی بڵێت ئەوەی دەیڵێم بۆچوونی خۆمە، دواتر بڵێت من پەروەردگاری ئێوەم! کەچی هانا بۆ ئەوە دەبات کە لەژێری ناوی پەروەردگاردا قسەکانی خۆی بکات، ئایا ئەمە خۆ حەشاردان نییە لە پشتی پەردەی دەقەکانەوە؟ ئاخۆ بازرگانییەکی تر نییە بەناوی خواوە لەکاتێکدا هیچ پەیوەندی بە پەڕتووکەکەی خواوە نییە؟

وتەیەکی ڕوونی موحەممەد شەحروور هەیە پێدەچێت هاوکار بێت بۆ تێگەیشتن لە هۆکاری ئەم گەمەی کە لەبواری ئاییندا دەیکات، لە میانەی وتارێکیدا کە لە پەیمانگای پەیوەندییە ڕۆشنبیرییەکانی دەرەوەی ئەڵمانیادا بوو، وتی:

"دەڵێم: ئایین لە ناوچە عەرەبی و ئیسلامییەکاندا تاکە پێکهێنەری ڕۆشنبیری و بزوێنەری بنچینەیی ڕەفتارەکانە، بۆیە زۆر پێویستمان بە ڕوونکردنەوە و بنەماکاریی هەیە بۆ ئەم تیگەیشتنانە لەرێگەی چاکسازی لە داهێنان و ئاییندا، بۆئەوەی ئەم تێڕوانینانە ببێت بە بەشێک لە ئایین."[٣])[٤]

---

(١) سورة النازعات, (الآية: ٢٤).

(٢) سورة الغافر، (الآية: ٢٩).

(٣) الإسلام الأصل و الصورة، (ص٨٣).

(٤) مەبەستی ئەوەیە کە مادام ئاین بنچینە و بزوێنەری رۆشنبیریی و شارستانییەتە، پێویستە

بەڕاستی ئەمە ڕەفتارێکی پراگماتیکی پلە باڵایە، چونکە هیچ گوێ بە هەقیقەت نادات، بەڵکوو زۆر بە ڕوونی دەڵێت:"تێڕوانینە عالەمانییەکان شکۆناکەن مەگەر لەژێر پەردەی ئاییندا بخرێنە ڕوو، مەگەر نا هەرگیز هیچ کاریگەرییەکی نابێت لە ناوچە عەرەبی و ئیسلامییەکاندا." ئەڵبەتە ئەمە بە دەربڕینێکی ڕوونتر:

(هەر هزرێکی لاهووتی سەلما کە بەهایەکی هەیە لە ژیانی بەرجەستە و هەستپێکراودا، کەواتە ئەوە هزرێکی تەواوە لای کەسانی پراگماتیکی، و مانای وایە بەو ئاستە سوود بەخشە.)[1]

ئەمە ڕەفتارێکی ئایدۆلۆژییە کە هیچ پەیوەندی بە بوارەکانی زانستەوە نییە، بەڵکوو لەڕاستیدا کاڵا فرۆشی و ساغ کردنەوەی بیرێکی سواوە لە بازاڕەکانی هزردا، بەڵام بە پەردەپۆشیی ئایینەوە، چونکە کڕیارەکان تەنیا بە بانگەشە و ڕیکلامی ئایینی سەرنجیان ڕادەکێشرێت بۆ کڕین، بەڵام دوای هەموو ئەوانە بە مەحەممەد شەحروور دەڵێین: تەنانەت ئەگەر ئەم ڕێگەیشت گرتۆتە بەر بۆ ساغ کردنەوەی کاڵا بێ بەهاکانت، نەتتوانیوە تۆکمە و جوان ئەنجامی بدەیت، بەڵکوو هەموو ئەو دێڕە ڕەشانەی کە پەڕەی پەڕتووکەکانت پێ پڕکردوون هیچ نین جگە لە تەواوکارییەک بۆ ناونیشانەکەمان کە «نەنگترین چەواشەکاریی»یە.

---

ئێمە هەرچیمان دەوێت لەژێر پەردەی ئایندا بیخەینەڕوو بۆ میللەتانی موسڵمان! (خوای گەورە خەجاڵەتی بکات بۆ چ مرۆڤێک بوو) (وەرگێڕ).

(١) البراجماتية، وليم جيمس، (ص٩٦).

# سەرچاوەکان

تجفيف منابع الإرهاب، محمد شحرور، معهد الدراسات الفكرية المعاصرة، لبنان - بيروت، توزيع الأهالي، دمشق - سوريا، الطبعة الأولى: ٢٠٠٨.

الدولة والمجتمع، محمد شحرور، الأهالي للطباعة والنشر والتوزيع.، دمشق، سوريا.

الدين والسلطة: قراءة معاصرة للحاكمية، محمد شحرور، دار الساقي، بيروت - لبنان، الطبعة الأولى: ٢٠١٤ م.

السنة الرسولية والسنة النبوية، رؤية جديدة، محمد شحرور، دار الساقي، بيروت - لبنان، الطبعة الأولى: ٢٠١٢ م.

الكتاب والقرآن، محمد شحرور، الأهالي للطباعة والنشر والتوزيع، دمشق - سوريا.

مجموع فتاوى لأحمد بن تيمية، جمعها وترتيبها: عبد الرحمن بن قاسم، يساعده ابنه محمد، طبع بأمر: فهد بن عبد العزيز آل سعود، طبع في المدينة المنورة بمجمع الملك فهد لطباعة النبيل. مصحف بإشراف وزارة الشؤون الإسلامية والأوقاف والدعوة والإرشاد ١٤٢٥ هـ - ٢٠٠٤ م.

مختصر الصواعق المرسلة على الجهمية والمعطلة، ابن قيم الجوزية، تحقيق: سيد ،عمران دار الحديث، القاهرة، ٢٠٠٥م.

المغالطات المنطقية، عادل مصطفى، المجلس الأعلى للثقافة القاهرة، ٢٠٠٧م.

نحو أصول جديدة للفقه الإسلامي، محمد شحرور، الأهالي للطباعة والنشر، دمشق - سورية، الطبعة الأولى ٢٠٠٠م.

الرسالة، محمد بن إدريس الشافعي، تحقيق: أحمد شاكر، مكتبة دار التراث القاهرة، الطبعة الثانية: ١٩٧٩م.

قصة حياة تشارلس داروين :تحرير فرانسيس داروين، ترجمة ومراجعة مجدي محمود المليجي المركز القومي للترجمة، القاهرة، ٢٠١١م.

القصص القرآني قراءة معاصرة، محمد شحرور، دار الساقي بالاشتراك مؤسسة الدراسات الفكرية المعاصرة، بيروت -لبنان، الطبعة الأولى : ٢٠١٠م، الجزء الأول.

القصص القرآني قراءة معاصرة، محمد شحرور، دار الساقي، بيروت - لبنان، الطبعة الأولى: ٢٠١٢م، الجزء الثاني.

الموسوعة الفقهية، وزارة الأوقاف والشؤون الإسلامية - الكويت طباعة ذات السلاسل - الكويت، الطبعة الثانية: ١٤٠٦ هـ - ١٩٨٦م.

صحيح البخاري، محمد بن إسماعيل البخاري، دار ابن كثير، دمشق — بيروت، الطبعة الأولى: ١٤٢٣هـ — ٢٠٠٢م.

الكتاب المقدس، نداء الرجاء - شتوتغارت - ألمانيا، ترجمة: فاندایاك والبستاني منقحة: ١٩٩١م.

شرح الإيمان المسيحي، أمبروسيوس أسقف ميلان) ترجمة نصحي عبد الشهيد المركز الأرثوذكسى للدراسات الآبائية القاهرة، ٢٠٠٥م.

سنن أبي داود سليمان بن الأشعث السجستاني، حققه: شعيب الأرنؤوط، محمد كامل قره بللي عبد اللطيف حرز الله، دار الرسالة العالمية، دمشق، الطبعة الأولى: ١٤٣٠ هـ - ٢٠٠٩م.

الفتاوى والرسائل الصغرى، أحمد الغماري، جمع وترتيب عبدالله التليدي، الطبعة الأولى: ٢٠٠١م.

الحقيقة والمجاز في الكتاب والسنة وعلاقتهما بالأحكام الشرعية، حسام الدين موسى عفانة، إشراف: ياسين الشاذلي، جامعة أم القرى / كلية الشريعة والدراسات الإسلامية (رسالة ماجستير : ١٩٨١ م — ١٩٨٢م).

الحقيقة والمجاز، أحمد بن تيمية تحقيق محمد بن حامد بن عبد الوهاب دار البصيرة، الإسكندرية.

إحياء علوم الدين محمد الغزالي (أبو حامد)، وبذيله المغني عن حمل الأسفار في الأسفار في تخريج ما في الإحياء من الأخبار، عبد الرحيم بن الحسين العراقي، دار إحياء الكتب العربية، فيصل عيسى البابي الحلبي.

الإشارة إلى الإيجاز في بعض أنواع المجاز، عز الدين عبد العزيز بن عبد السلام، دار المعرفة، بيروت - لبنان.

دامغ الباطل وحتف المناضل علي بن الوليد، تقديم وتحقيق مصطفى غالب، مؤسسة عز الدين بيروت - لبنان، ١٩٨٢م.

بحثًا عن عالم أفضل كارل بوبر، ترجمة: أحمد مستجير مهرجان القراءة للجميع، ١٩٩٩م.

الكافية الشافية في الانتصار للفرقة الناجية، محمد بن أبي بكر بن أيوب ابن قيم الجوزية، تحقيق: محمد بن عبد الرحمن العريفي - ناصر بن يحي الحنيني - عبد الله بن عبد الرحمن الهذيل - فهد بن علي المساعد، دار عالم الفوائد، مكة، الطبعة الأولى: ١٤٢٨هـ.

الإسلام الأصل والصورة، محمد شحرور، طوى للنشر والثقافة والإعلام، لندن، الطبعة الأولى: ٢٠١٤م.

موقف ابن تيمية من المعرفة القبلية وشيء من آثاره الفلسفية يوسف سمرين، إشراف سري نسيبة جامعة القدس فلسطين (رسالة ماجستير / ٢٠١٧م).

حاشية البيجوري على جوهرة التوحيد، حققه وعلق عليه علي جمعة، دار السلام للطباعة والنشر والتوزيع، القاهرة، الطبعة الأولى: ١٤٢٢ هـ - ٢٠٠٢ م.

المغني في أبواب التوحيد والعدل، القاضي عبد الجبار، قوم نصه: إبراهيم الأبياري، إشراف طه حسين، لجنة التأليف والترجمة والنشر، القاهرة - مصر.

شرح العقيدة الطحاوية، شجاع الدين هبة الله بن أحمد الحنفي الماتريدي، تحقيق جاد الله بسام صالح دار النور المبين للنشر والتوزيع، عمان - الأردن، ٢٠١٤م.

الخلاف محمد بن الحسن ا مؤسسة النشر الإسلامي التابعة لجماعة المدرسين، قم - إيران، الطبعة الأولى:١٤١٧هـ.

الإصباح على المصباح في معرفة الملك الفتاح، إبراهيم بن أحمد المؤيدي، تحقيق: عبد الرحمن بن حسين محمد بن شايم، مؤسسة الإمام زيد بن علي الثقافية، صنعاء - الجمهورية اليمنية، الطبعة الأولى: ١٤٢٢هـ - - - ٢٠٠٢م.

الحق الدامغ، أحمد بن حمد الخليلي، سلطنة عمان - مسقط،١٤٠٩هـ.

طبقات الشافعية الكبرى، تاج الدين أبو نصر عبد الوهاب بن علي بن عبد الكافي السبكي، تحقيق: محمود محمد الطناحي - عبد الفتاح الحلو، فيصل عيسى البابي الحلبي، ١٣٨٣هـ -١٩٦٤م.

مدارج السالكين ابن قيم الجوزية، تحقيق: ناصر بن سليمان السعوي - علي بن عبد الرحمن القرعاوي -صالح بن عبدالعزيز التويجري . - خالد بن عبد العزيز الغنيم - محمد بن عبد الله الخضيري، دار الصميعي للنشر والتوزيع، الرياض، ١٤٣٢ هـ -٢٠١١م.

العقيدة الواسطية، أحمد بن تيمية، تحقيق: أشرف بـن عبدالمقصود أبو محمد أضواء السلف الرياض، الطبعة الثانية:١٩٩٩م.

جامع العلوم والحكم في شرح خمسين حديثا من جوامع الكلم، ابن رجب الحنبلي، تعليق وتحقيق ماهر ياسين الفحل، دار ابن كثير دمشق - بيروت الطبعة الأولى: ١٤٢٩ هـ - ٢٠٠٨م.

أرسطو عند العرب، دراسة ونصوص غير منشورة، عبد الرحمن بدوي، وكالة المطبوعات ،الكويت، الطبعة الثانية، ١٩٧٨م.

كتاب النفس، أرسطو طاليس، نقله إلى العربية أحمد فؤاد الأهواني، راجعه عن اليونانية جورج قنواني، دار إحياء الكتب العربية مصطفى البابي الحلبي وشركاؤه، الطبعة الأولى:١٩٤٩م.

الإشارات والتنبيهات، ابن سينا، مع شرح: نصير الدين الطوسي، تحقيق: سليمان دنيا دار المعارف، القاهرة — مصر الطبعة الثالثة.

أرسطو طاليس المعلم الأول، ماجد فخري، المطبعة الكاثوليكية، بيروت - لبنان، ١٩٥٨م.

منطق أرسطو، تحقيق: عبد الرحمن بدوي، وكالة المطبوعات - الكويت، دار القلم بيروت - لبنان، الطبعة الأولى ١٩٨٠م.

تهافت الفلاسفة، أبو حامد الغزالي، دار المعارف بمصر، الطبعة الرابعة.

فك الشيفرة الماسونية، إيان جيتينز، ترجمة غادة حرب دار صفحات للنشر والتوزيع، دمشق - سورية، الإصدار الأول:٢٠١٢م.

(٤٦) الإسلام والإنسان من نتائج القراءة المعاصرة، محمد شحرور، دار الساقي، بيروت - لبنان، الطبعة الأولى: ٢٠١٦م.

الإحكام في أصول الأحكام علي بن أحمد بن سعيد بن حزم الأندلسي أبو محمد، دار الآفاق الجديدة، بيروت – لبنان ١٤٠٣ هـ - ١٩٨٣م.

أم الكتاب وتفصيلها؛ قراءة معاصرة للحاكمية الإنسانية تهافت الفقهاء والمعصومين محمد شحرور، دار الساقي، بيروت -لبنان، الطبعة الأولى: ٢٠١٥م.

الجامع لسيرة شيخ الإسلام ابن تيمية خلال سبعة قرون، محمد عزير شمس - علي بن محمد العمران دار عالم الفوائد مكة المكرمة، الطبعة الثانية: ١٤٢٢هـ.

الرد على الجهمية والزنادقة فيما شكوا فيه من متشابه القرآن وتأولوه على غير تأويله، أحمد بن حنبل، تحقيق: صبري بن سلامة شاهين دار الثبات للنشر والتوزيع، الطبعة الأولى: ١٤٢٤ هـ - ٢٠٠٣م.

الملل والنحل، محمد بن عبد الكريم الشهرستاني، صححه أحمد فهمي محمد، دار الكتب العلمية، بيروت - لبنان، الطبعة الثانية: ١٩٩٢م.

مقالات الإسلاميين واختلاف المصلين، أبو حسن الأشعري، تحقيق: محمد محي الدين عبد الحميد المكتبة العصرية صيدا - بيروت، ١٤١١ هـ - - ١٩٩٠م.

الحلاج الأعمال الكاملة، جمع : قاسم محمد عباس، دار رياض الريس، الطبعة الأولى: ٢٠٠٢م.

فتح المجيد شرح كتاب التوحيد عبد الرحمن بن حسن بن محمد بن عبد الوهاب حققه : عبد القادر الأرنؤوط، مكتبة دار البيان، دمشق – بيروت، الطبعة الأولى: ١٩٨٢م.

القاعدة المراكشية ابن تيمية تحقيق ناصر بن سعد الرشيد - رضا بن نعسان معطي، مطابع الصفا - مكة المكرمة، ١٤٠١هـ.

تناقضات منهجية ؛ نقد رسالة عدنان إبراهيم للدكتوراه، يوسف سمرين، مركز

،دلائل، الرياض، الطبعة الأولى: ١٤٣٨هـ.

مختارات ماركس وإنجلس، دار التقدم موسكو – الاتحاد السوفيتي.

الإسلام والإيمان منظومة القيم، محمد شحرور، الأهالي للنشر والتوزيع، دمشق - سورية، الطبعة الأولى: ١٩٩٨م.

نشأة الإنسان تشارلس داروين ترجمة وتقديم: مجدي محمود المليجي، المجلس الأعلى للثقافة، القاهرة، ٢٠٠٥م.

أصل الأنواع؛ نظرية النشوء والارتقاء تشارلز داروين، ترجمة: إسماعيل مظهر، دار التنوير للطباعة والنشر والتوزيع، بيروت - لبنان، سنة الطبع: ٢٠٠٨م.

كتاب التوحيد، أبو منصور محمد بن محمد الماتريدي السمر قندي، تحقيق: بكر طوبال أو غلى، محمد آروشي، دار الصادر، بيروت – لبنان.

الإقناع في مسائل الإجماع علي بن محمد بن عبد الملك (أبو الحسن بن القطان)، تحقيق حسن بن فوزي الصعيدي الفاروق الحديثة للطباعة والنشر، الطبعة الأولى: ١٤٢٤ هـ -٢٠٠٤ م.

ديلكتيك الطبيعة فريدريك إنجلز، نقله إلى العربية وقدم له: توفيق سلوم، دار الفارابي، بيروت - لبنان، الطبعة الثانية:٢٠١١م.

الرد على المنطقيين أحمد بن تيمية دار ترجمان السنة، لاهور باكستان، ١٣٩٧ هـ - ١٩٧٦م.

شرح ابن عقيل على ألفية ابن مالك علق عليه: قاسم الشماعي الرفاعي، دار القلم، بيروت - لبنان.

ذخائر الأعلاق شرح ترجمان الأشواق، محيي الدين بن عربي،المطبعة الأنسية، بيروت، ١٣١٢هـ

نقد الفكر الديني، صادق جلال العظم، دار الطليعة للطباعة والنشر، بيروت ،لبنان الطبعة الثانية: ١٩٧٠م.

علم اللاهوت، بحسب معتقد الكنيسة القبطية الأرثوذكسية ميخائيل مينا، تقديم يوساب الثاني، مطبعة الأمانة – مصر، الطبعة الرابعة ١٩٤٨م.

الغيث المنسجم في شرح لامية العجم، واللامية للطغرائي والشارح هو صلاح الدين الصفدي، وبهامشه: سرح العيون في شرح رسالة ابن زيدون لمحمد بن نباتة المصري، المطبعة الأزهرية المصرية، الطبعة الأولى ١٣٠٥ هـ..

الداروينية الجديدة: صانع الساعات الأعمى، ريتشارد دوكنز، ترجمة مصطفى إبراهيم فهمي، دار العين للنشر، الطبعة الثانية: ٢٠٠٢م.

لماذا أنا ملحد ؟، إسماعيل أحمد أدهم، مطبعة التعاون - الإسكندرية، ١٩٣٧م.

فلسفات عصرنا تياراتها ،مذاهبها أعلامها، وقضاياها، جان فرانسوا دورتيي، ترجمة: إبراهيم صحراوي، الدار العربية للعلوم ناشرون، بيروت - لبنان، الطبعة الأولى: ٢٠٠٦م.

منطق البحث العلمي كارل بوبر ترجمة وتقديم: د. محمد البغدادي، المنظمة العربية للترجمة، بدعم من مؤسسة الفكر العربي، توزيع مركز دراسات الوحدة العربية، الطبعة الأولى: شباط (فبراير) ٢٠٠٦م.

أفول الأصنام، فريريك نيتشه ترجمة حسان بورقية، محمد الناجي، أفريقيا الشرق، الطبعة الأولى: ١٩٩٦م.

مراسلات ماركس إنجلز، ترجمة: فؤاد أيوب، دار دمشق للنشر والتوزيع، ط ١، ١٩٨٣م.

البراجماتية، وليم جيمس ترجمة محمد علي العريان، تقديم: زكي نجيب محمود المركز القومي للترجمة، القاهرة - مصر، ٢٠٠٨م.

الموسوعة الفلسفية، بإشراف روزنتال، يودين، ترجمة: سمير كرم مراجعة صادق جلال العظم، جورج طرابيشي، دار الطليعة للطباعة والنشر، بيروت – لبنان.

منهاج السنة النبوية في نقض كلام الشيعة والقدرية، أحمد ابن تيمية، تحقيق: محمد رشاد سالم، جامعة الإمام محمد بن سعود الإسلامية، الطبعة الأولى : ١٤٠٦ هـ - ١٩٨٦م.

تأسيس ميتافيزيقا الأخلاق، أمانويل كنت ترجمة عبد الغفار مكاوي، منشورات الجمل كولونيا - ألمانيا، الطبعة الأولى: ٢٠٠٢م.

تفسير القرآن العظيم إسماعيل بن عمر ابن كثير، حققه سامي بن محمد السلامة، دار طيبة للنشر والتوزيع، الرياض - المملكة العربية السعودية، الطبعة الثانية: ١٤٢٠ هـ - ١٩٩٩م.

درس القرن العشرين كارل بوبر ترجمة: الزواوي بغورة لخضر مذبوح الدار العربية ناشرون - لبنان، منشورات الاختلاف - الجزائر، الطبعة الأولى: ١٤٢٩ هـ - ٢٠٠٩م.

أصول الأصوليات والتعصبات السلفية، روجيه جارودي، مكتبة الشروق، يناير ١٩٦٦م.

البحث عن الزمن المفقود؛ جانب منازل السلوان، مارسيل بروست، ترجمة: إلياس بديوي، دار شرقيات للنشر والتوزيع القاهرة، الطبعة الثانية: ١٩٩٥م.

الرد على الجهمية، عثمان بن سعيد الدارمي، قد له وخرج أحاديثه بدر البدر، الدار السلفية، الكويت، الطبعة الأولى: ١٤٠٥ هـ - ١٩٨٥م.

رد الدارمي عثمان بن سعيد على بشر المريسي العنيد، صححه وعلق عليه: محمد حامد الفقي، دار الكتب العلمية، بيروت - لبنان.

الاختلاف في اللفظ والرد على الجهمية والمشبهة، عبد الله بن مسلم بن قتيبة، قدم له وعلق عليه عمر بن محمود، دار الراية الرياض، الطبعة الأولى: ١٩٩١م.

كفاحي، أدولف هتلر، ترجمة: لويس الحاج، بيسان، الطبعة الثانية: ١٩٩٥م.

خرافات عن الأجناس جوان كوماس ترجمة: محمد رياض، مؤسسة هنداوي للتعليم والثقافة، القاهرة.

الإسلام والنزعة الإنسانية العلمانية، صادق جلال العظم ترجمة: فالح عبد الجبار، دار المدى للثقافة والنشر، دمشق - بيروت، الطبعة الأولى: ٢٠٠٧م.

الفهرست، محمد بن إسحق النديم دار المعرفة، بيروت - لبنان.

أساس التقديس، محمد بن عمر الرازي، تحقيق: أحمد حجازي السقا، مكتبة الكليات الأزهرية، القاهرة.

بيان تلبيس الجهمية في تأسيس بدعهم الكلامية، أحمد ابن تيمية، مجمع الملك فهد لطباعة المصحف الشريف ١٤٢٦هـ.

البديل، روجيه جارودي، ترجمة طرابيشي، دار الآداب، بيروت - لبنان.

الخلاصة اللاهوتية، توما الأكويني، ترجمه من اللاتينية إلى العربية بولس عواد طبع بالطبعة الأدبية، بيروت — لبنان ١٨٨٧م.

الأم، محمد بن إدريس الشافعي، تحقيق وتخريج: رفعت فوزي عبد المطلب، دار الوفاء - المنصورة، الطبعة الأولى: ١٤٢٢هـ - ٢٠٠١م.

آداب الشافعي ومناقبه، عبد الرحمن بن أبي حاتم الرازي تحقيق: عبد الغني عبد الخالق تقديم محمد زاهد الكوثري دار الكتب العلمية، بيروت - لبنان، الطبعة الأولى: ٢٠٠٣م.

الكنز المدفون والفلك المشحون، جلال الدين السيوطي ضبطه محيي الدين الصغير، دار الكتب العلمية، بيروت-لبنان.

المواقع الإلكترونية:

http://shahrour.org

http://www.aljazeera.net

http://www.un.org/ar

يوتيوب:

عبقرية ،داروين، ريتشارد دوكنز

# ناوەڕۆک




زۆر هەوڵدرا بۆ دەرهێنانی قورئانی پیرۆز لە دڵ و ژیانی موسڵماناندا، بەڵام دوای ئەوە بۆیان دەرکەوت کە ئەستەمە وشەکانی بگۆڕن و یاری بە پیتەکانی بکەن، ناچار پەنایان برد بۆ گۆڕینی ماناکانی لەژێر پەردەی "خوێندنەوەی سەردەمیانە بۆ قورئان"، جا لادان و بیدعەی وەهایان کردووە بۆ وشە و دەقەکانی لە ڕاڤە و مەبەستەکانیدا هەرگیز خوای گەورە بەو ڕەهەندە پەیامەکەی نەناردووە، هەرگیز موسڵمانان لە ماوەی 1400ساڵدا لادانی وایان نەبینیوە، لەم هەوڵەدا؛ ڕێچکەی کرۆکگەراکان (باتنییەکان)یان گرتووەتەبەر، بەڵام بانگەشەی ماناکاری بۆ قورئان بە شێوازێکی تر کە بە جۆرێک بوو کەس نایزانێت جگە لە ئەوان!



نرخ : ٤٠٠٠ دینار


9 782562 101760